Farhan kurdi

چاپی چوارەم

# چۆن لەگەڵ خەڵکی گفتوگۆ بکەین!!

٩٢ یاسای هونەری هاورێگرتن
هونەری ئەتەکێتی هەڵسوکەوت

لیل لۆندز

**HOW TO TALK TO ANYONE**

**LEIL LOWNDES**

# چۆن لەگەڵ خەڵکی گفتوگۆ بکەین!!

**٩٢ یاسای هونەری هاوڕێگرتن**

**هونەری ئەتەکێتی هەڵسوکەوت**

نوسینی: لیل لۆندز

وەرگێڕانی: جەبار عەبدولکەریم

چاپی سێیەم

# چۆن لەگەڵ خەڵکی گفتوگۆ بکەین


ناوی کتێب: چۆن لەگەڵ خەڵکی گفتوگۆ بکەین!

نوسینی: لیل لۆندز

بابەت: ئەتەکێتی گفتوگۆ

وەرگێڕانی: جەبار عەبدولکەریم

دیزاین: فازیل کەلۆسی

چاپخانە: تاران

نۆرەی چاپ:سێیەم 2018

تیراژ:١٠٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی( ١٦٩٨ ) ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

بۆدەسکەوتنی بڵاوکراوەکانی ناوەندی سایە بەتاکو کۆ..



ناونیشان: سلێمانی – شەقامی پیرەمێرد

Emil: saya.book@yahoo.com 07512460583

## پێڕست

لەم ژیانەدا تووشی دوو دەستە لەخەڵکی دەبین یەکەمیان دێنە ژورەوە دەڵێن:"باشە، من لێرەم!" دووەمیان دێنە ژورەوە دەڵێن: "ئاه، تۆ لێرەیت."

پێشەکی

## چۆن بکەین بەوەی دەمانەوێت

ئایا تائێستا ستایشی کەسانێکت کردووە کەوا دەردەکەوێ ئەوەی دەیانەوێ بۆیان ڕەخساوە؟ ئەو کەسانە دەبینیت لەکۆڕی بازرگانیو میوانداریە کۆمەلاتییەکاندا بەوپەڕی خاترجەمیو دڵنیاییو متمانەی بالابەخۆ بوونەوە بدوێن. ئەوانە کەسانێکن باشترین پیشەو هاوسەرو هاوڕێیان هەیەو هەمیشە حسابی بانکیان پڕە لەپارە.

بەلام خێرا مەڕۆو بەپەلە دادڤانی مەکە! زۆرێك لەوانە لەتۆ زیرەکترو کارامەتر نین، زیاتر لەتۆیان نەخوێندووە تەنانەت لەتۆ نایابتر نین، بەم پێو دانگە باسەکە چییە؟

هەندێك دەڵێن ئەوان ئەم خەسڵەتەیان بەمیرات بۆ ماوەتەوە یان گەلێك بەئاسانی خاوەنی بەختو ئیقبالێکی بەرزن. هۆی سەرکەوتویی ئەمجۆرە کەسانە ئەمەیە لەپەیوەندی خۆیان لەگەڵ کەسانیتر خاوەنی کارامەیی زیاترن.

دەزانیت هیچ کەسێك بەتەنها ناگاتە لوتکە، ئەوانەی وادەردەکەون هەمموو خواستەکانیان گەشتوون، کەسانێکن بەدرێژایی ساڵ دڵو دەروونی سەدان کەسیان بەدەست هێناوە تاکو بەوانەوە لەهەموو چالاکیەکانی خۆیان کۆمەك وەرگرن.

زۆرێك لەو کەسانە دەڕوانن کەبەپلەی پەیژەیەکدا سەردەکەون دەڵێن ئەمانە کەسانێکی خۆ ویستن. کاتێ ئەکتەرانی مەزن هاوڕێیەتیان ناکەن، یان لەکاری بازرگانیدا هاوکارییان ناکەن یان درێغی عەشقیان لێدەکەن، ئەوان بەمانەیان تۆمەتبار دەکەنو دەڵێن پەیوەندیان بەم گروپو بەو گروپەوە هەیە.

ئەوانە بەردەوام گلەیی‌و سکاڵا دەکەن هەرگیز ئاگایان لەوە نییە خەتای خۆیان بووە کەوا گوێیان پێنەدراوە، هەرگیز ئاگایان لەوە نەبووە خودی خۆیان بووە پەیوەندیەکانیان لاواز بووە یان هاوڕێیەتی‌و پەیوەندییان بچڕاوە، ئەم کەسانە باوەڕیان وایە کەسانی سەرکەوتوو کیسەی پڕ لەفێڵو فریان هەیە.

موعجزەیەیەك لەکاریاندا هەیە وا ئەوانی گەیاندۆتە ترۆپکی سەرکەوتن.

بەڵام فێل‌و ڕێکاری ئەوان کامەیە؟ تووشی شتگەلێکی زۆر دەبیت، ئەوان ماددەیەکیان لەبەر دەستدایە هاوڕێیەتی بتەو دەکات، خاوەنی هونەرێکن کاریگەریی لەسەر دڵو دەرونیان هەیە، جادویەك دەزانن بەهۆیەوە کەسانێ شەیدای خۆیان دەکەن. ئەوان خاوەنی چۆنێتیەکن کەسەرۆکەکان دلیان دەمەزرێنن‌و پلەیان بەرەو باڵا دەبەن. خاوەنی خەسڵەتو تایبەتمەندیەکن کەموشتەریان دوبارە دێنەوە بۆلایان، دارایییەکیان هەیە کەخەڵکی لێیان دەکڕێت‌و لەڕکابەرەکانیان هیچ شتێك ناکڕن.

هەمووومان خاوەنی ئەم ڕێکارانەین، بەڵام ئەوانەی لەم ڕێکارانە زیاتریان هەیە، کەسانی سەرکەوتوون، لەم کتێبەدا بەچەندین جۆری ئەو ڕێکارانە ئاشناتان

دەکەین، دەتوانن بەبەکاربردنیان بگەنە ئەوجی کەماڵو ئەوەی لەژیاندا خوازیارن بۆی مسۆگەری بکەن.

## چۆن ڕێکارە سادەکان دەناسرێنەوە

ساڵانێك لەمەوبەر مامۆستای شانۆ لەخراپی ڕۆڵ دیتنی من لەشانۆیەکدا کەلە کۆلێژ نمایش دەکرا زۆر تووڕە بوو: "نا! نا! جەستەت لەگەڵ ووشەکانت پێکەوە ناگونجێن. جوڵەی جەستەت ئەندێشەکانی تۆ ئاشکرا دەکەن، ڕەنگو ڕوخساری تۆ خاوەنی ئەو توانایەن حەوت هەزار جۆر بەرجەستە بکەن، هەر بەرجەستە کردنێك هەواڵی ئەوە ڕادەگەیێنێ تۆ کێیت لەمساتەدا بەتایبەتی چ خەیاڵێك لەسەرتدایە."

پاشان قسەیەکی کرد هەرگیز فەرامۆشی ناکەم: "و جەستەت، جۆری جوڵە پێکردنی جەستەت ئۆتۆ بیۆگرافی تۆ لەکاردایە."

چەن ڕاستی کرد. لەمەیدانی ڕاستەقینەی ژیاندا هەر جوڵەیەکی فیزیکی ئێوە ژیانی ئێوە دەگوێزێتەوە. سەگەکان دەنگێك دەبیستن گوێیەکانی ئێمە توانای بیستنی ئەو دەنگانەیان نییە. شەمشەمە کوێرەکان لەتاریکیدا شتانێك دەبینن ئێمە توانای دیتنی ئەو شتانەمان نییە، مرۆڤەکان جۆرە جوڵەیەك دەکەن کەدورە لەهۆشیاری مرۆڤەوە بەڵام خاوەنی توانایەکی سەرسوڕهێنەرن بۆ چونە ناو ناخی کەسانیتر. هەر زەردەخەنەیەك، هەر گرژو مۆنییەك، یان هەر وشەیەك کەبۆ ئاخاوتن بژاردەی دەکەن. دەتوانێ کەسانیتر بەرەو ئێوە کێش بکات یان لەئێوەی دور بخاتەوە.

وابزانە دوو کەس لەفەزایەکدان تەوەرەی تەواوی ئەو ئاماژانەیان هەیە کە هەواڵیان پێدەگەیێنێت، لەیەك چرکەدا نزیکەی دە هەزار ئامازەیان پێدەکرێت. یەکێ لەئوستادەکانی زانکۆی پەنسلیڤانیا دەڵێت: "گۆڕینەوەی زانیاری نێوان

دوو کەس لەماوەی یەك کاتژمێردا، نیوەی دانیشتوانی ئەمریکا دەبێت ئەوانی تەمەنیان لەهەوڵی ئەوەدا بن وەڵامیان بدەنەوە."

بەم هەموو دەسبەکاریی و بزاوتنە جوانانەوە کەلەنێوان دوو کەسدا ئاڵوگۆڕ دەکرێت، ئایا دەتوانین تەکنیکەکان بدۆزینەوە تاکو ئاڵوگۆڕەکانمان دەرکەوون، متمانەو دڵنیابونێك بێتە ئاراو بتوانین کەسانیتر بەرەو خۆمان کێش بکەین؟

بۆ زیاتر ڕونبونەوەی ئەم پرسە هەر کتێبێك لەبواری کارامەیی پەیوەندی کاریزماو کیمیایی نێوان مرۆڤەکانم دەست کەوتبێت خوێندومەتەوە. دەربارەی سەدان شرۆڤە لەبواری چۆنێتی ڕێبەرایەتی و چوونەنێو دڵی خەڵکی خوێندومەتەوە، زانیانی بورای کۆمەڵایەتی هەرکامیان لەبواری جۆرلو جۆرەوە تێڕوانینی خۆیان دەربڕیوە، بیرساکانی چینی لەو باوەڕەدا بوون کاریزما دەبێت بەبەرنامەی خۆراکیی هاوتا بێت.

"دیل کارنگی" بۆ سەدەی بیستەم کەسایەتیەکی مەزن بوو

بەڵام ئێمە لەسەدەی بیست و یەدا ژیان دەکەین.

زۆرینەی توێژینەوە ئەنجامدراوەکانی کتێبی کلاسیکی دیل کارنگی یاساکانی هاوبیروڕاکردنی خەڵکی کەلە ساڵی ١٩٣٦ نوسراوە، ئەوە دەڕاستێنن. ئەو لەوباوەڕەدا بوو بۆ سەرکەوتن دەبێت خەندە لەسەر لێوان بێت. خۆشەویستی بۆ کەسانیتر دەر ببڕێت و کارێك بکەیت ئەوان هەستێکی باشیان هەبێت. بەخۆم وت: "سەیر نییە." ئەم بابەتانە ئەمڕۆ زیاتر لەهەفتا ساڵی تێپەڕاندووە زۆر ڕاستن و حەقیقەتیان هەیە، بەم پێیە ئەگەر قسەو بیردۆزەکانی "دیل کارنگی" بۆ هاوبیروڕاکردنی خەڵکی و کاریگەریی لەسەر کەسانیتر تائەم ئاستە

بەسوودو گونجاوون، ئیدی چ پێویست بەوە دەکات بەدوای کتێبێکی دیکەدا بگەڕێین؟ بەدوو پاساوی زۆر گەورەو گرنگ.

**پاساوی یەکەم:**

گریمان کەسێکی پیرۆز پێت دەڵێت: "کاتێ لەحاڵێکی ئاوادا دەبێت بەمجۆرە بدوێ." بەڵام هیچ وانەیەکی زمانت پێنادات. دیل کارنگی‌و زۆرێک لەپسپۆڕانی پەیوەندی بەستن وەك ئەم کەسە پیرۆزەن، ئەوان پێمان دەڵێن چی بکەین بەڵام فێرمان ناکەن چۆن ئەم کارە ئەنجام بدەین. لەم دنیا ئاڵۆزەی ئەمڕۆدا هێندە بەس نییە ئەگەر بڵێین: "بزەیەك بکە." بەس نییە بڵێین: "لەناخەوە ستایش‌و پیاهەڵگوتن بکە." بازرگانان‌و کسانی مەزنی ئەمڕۆ لەبزەو خەندەی تۆ شتی جۆراوجۆر دەردێنن. ئاڵوزیی زیاتر لەستایشەکانی ئێوە دروست دەکەن. کەسانی نایاب‌و سەرکەوتووی سەردەمی ئێمە هەموو بزەو ستایش‌و پیاهەڵگوتنەکانی دەورو بەری خۆیان دەبینن‌و بەمۆرەیەك وەڵامیان دەدەنەوە. کڕیاران لەبیستنی قسەی فرۆشیاران بێزارو ماندوو بوون‌و کە"چەندە ئەم جۆرە جل‌و بەرگەتان لێ دێت".

**پاساوی دووەم:**

دنیا بەبەراورد لەگەڵ ساڵی١٩٣٦ گۆڕانی بنەڕەتی بەسەردا هاتووە لەئەنجامیشدا بۆ سەرکەوتن پێویستمان بەهاوکێشەی نوێتر هەیە، بۆ دۆزینەوەیان لەسۆپەر ستارەکان وردبومەتەوە،بەو تەکنیکانەی فرۆشیارە مەزنەکان بۆ فرۆشتنی کاڵاکانیان بەکاری دێنن دیقەتێکی زۆرمداوە، سەرنجی کەسانی وتاربێژی بلیمەتمداوە کەچۆن وەڵامی دوێنەرەکانی خۆیان دەدەنەوە چ جۆرە ڕەوشێك بەکار دێنن. سەرنجی پاڵەوانانی وەرزشی بەرجەستەمداوە کەچۆن گەشتونەتە ترۆپکی سەرکەوتن. زانیم لەڕەوشی ئاڵۆز بەهرەمەند

بوون، ئەم ڕەوشە ئاڵۆزانەم کردووە بەچەن بەشی بچوکترەوەو دابەشم کردووە تاکو شێوەی سوود لێوەرگرتن بدۆزمەوە، بۆ هەرکامێکیان ناوێکم دلناوە کاتێ لەکاردا پێویستت پێێ هەبوو بەئاسانی بتوانی بیرت بکەوێتەوە، کاتێ ئەم شێوازەم وێنا کرد. ئەوانەم بۆ کەسانی جۆراو جۆر لەدورترین شوێنی وڵات باس کرد، بەشداربوانی سیمینارەکانم لەبورای پەیوەندی خاڵی سەرنجی خۆیان بۆ دەربڕیووم. کاتێ لەبەردەم سەرکەوتوترین و خۆشەویسترین ڕێبەراندا بووم زمانی جەستەی ئەوانم شیکار کرد، لەدەربڕینی ڕوخساریان ورد بوومەوە گوێم بۆ قسەکانیان گرت دیقەتمدا چ ووشەیەك بەکار دەبەن، وردبومە چۆن لەگەڵ ئەندامانی خێزان، هاوڕێیان، هاوکاران و ڕکابەرەکانیان دەدوێن. لەهەر ڕوویەکەوە خاڵێکی سەرنجم دیبێت داوام لێکردون لەمبارەوەیە زیاتر ڕونکردنەوەم بۆ بکەن، پێکەوە ئەم ڕەوشانەمان شیکار کردووەو ڕێکاری ئاسانم لێدروست کردووە تاکو کەسانیتر بتوانن سوودی لێی ببینن.

ئەزمونەکانی خۆم و خاڵی سەرنجی ئەو کەسە سەرکەوتوانەم لەم کتێبەدا هێناوە، هەندێك لەنمونەکان گەلێك نایابن، هەندێکیان نیشانەی سەرسامین، بەڵام زۆرینەیان دەسکەوتوون، کاتێ بەسەر ئەم ڕێکارانەدا زاڵ دەبیت هەموو ئەندامانی خێزان، هاوڕێ و ئاشنایان دڵەکانیان بەشادمانی بەڕوتاندا دەکەنەوە هەرچیتان بوێت بەئاسانی دەیخەنە بەردەستان.

پاداشتێك لەکاردایە، کاتێ کارامەیی نوێی پەیوەندی دنیای پێدەگەڕێت ئاوڕێك بۆ دوای خۆت دەدەیتەوە کۆمەڵێك دەبینیت پێت پێدەکەنن.

## بەشی یەکەم

## چۆن بەبێ درکاندنی وشەیەک
## بڕوای کەسانیتر بۆ خۆمان کێش بکەین

### تەنها دە چرکە دەرفەتت هەیە کە
### بیسەلمێنیت کەسێکی خۆتیت

دروست ئەو ساتەی ئێمەی مرۆڤ چاومان بەیەکتری دەکەوێت دەتوانین کاریگەری بەرزین لەسەر یەکتریی بەجێ بێڵین. یەکەمین بینین‌و حاڵەت‌و نیمەنی تۆ لەسەر کەسێك کەڕوبەڕوی دەبیتەوە کاریگەری دروست دەکات‌و دەتوانێ بۆ هەمیشە لەناخ‌و زەینیدا بمێنێتەوە.

هونەرمەندان هەندێجار دەتوانن ئەم وەڵامە خێراو ساتی هەستیارییە بەچاکی دەرك بكەن. هاوڕێکەم "روبیرت گروسمن" کاریکاتۆریستێکی گەلێك سەرکەوتووە بۆ بڵاوکراوەکانی وەك "فوربز، نیوزویك، سپۆرت ئیلا ستریتد، رولینگ ستون، کاریکاتێر ئامادە دەکات. باب نەك تەنها خاوەنی کارامەیی تایبەت بەخۆیەتی رواڵەتی فیزیکی کەسانیتر لەویژدانی خۆیدا تۆمار دەکات، بەڵکو دەتوانێ دەربارەی کەساتی ئەوان قووڵ بێتەوە. چاوخشانێك بەکاریکاتۆری ئەو کەسانەی ئەو وێنەیان دەکێشێت بەس تاکو بتوانی لەکەسایەتیان تێ بگەیت. جاری واهەیە لەمیوانیەکاندا باب لەسەر دەسڕی کلێنسی یەکێ لەمیوانەکان کاریکاتۆرێك دەکێشێت. ئامادەبوان پێیان سەیرە چۆن لەماوەیەکی کەمدا وێنەی یەکێ لەئامادەبوانی لەسەر دەسڕێك کێشا، کاتێ ئەو وێنەکە تەواو دەکات قەڵەمەکەی دادەنێت‌و دەسڕەکە دەدات بەو

کەسەی کاریکاتۆرەکەی کێشراوە. زیاتر ئەو کەسانەش سەرنجێکی سەیری دەدەن ڕەنگە بڵێت: "زۆر جوانە بەڵام بەڕاستی وێنەی من نییە."

بەڵام ئەوانیتر لەمیوانییەکەدا کاتێ سەیری ئەم کاریکاتۆرە دەکەن لەوەڵامیا دەڵێن: "با، وایە." بەم قسەیە هەر جۆرە دودڵیو گومانێك دەڕەوێننەوە. ئێستا کەسی مەبەست کەمێ گێژ بووە بەوێنەو بۆچونی کەسانیتر دەربارەی خۆی ورد دەبێتەوە. جارێك چوومە ستۆدیۆکەی باب، لێم پرسی: چۆن دەتوانێ کەسایەتی ئەوانیتر بەم جوانییە بخوێنێتەوە. وتی: "گەلێك ئاسان، هێندە بەسە لێیان بڕوانم." وتم: "چۆن کەسایەتیەکان دیاری دەکەیت؟ ئایا ناچار نیت دەربارەی جۆری ژیانو پیشینەی ئەو کەسە لێکۆڵینەوە بکەیت؟"

"نا، لیل هەروەك وتم تەنها لێیان دەڕوانم. "نایابە". ئەو بۆ زیاتر ڕونکردنەوە وتی: "تاڕادەیەك تەواوی حاڵەتی کەسایەتی ئەوان لەڕواڵەتیان، حاڵەتی جەستەیان، جۆری جوڵە کردنیان، ڕێ ڕۆشتنیان دەردەکەوێت." پاشان دۆسییەکی نیشاندام کاریکاتۆری ڕوخساری کەسانی سیاسی تێدا پارێزرابوو.

پاشان سەیری یەکێ لەکاریکاتۆرەکانی کرد بەئاماژە پێکردنەوە وتی: "ئەمە ڕوخساری منداڵیی کلینتۆنە." پاشان بەنیوە خەندەی جۆرج بوش ئامازەی کرد: "ئەمە ناجەربێنراوی جۆرج بوشە. وئەمە گرژو مۆنی نیکسۆنە." پاشان کاریکاتۆرێکی دیکەی هەڵگرت ڕوخساری فرانکلین دلانۆ رۆزفێلت بوو لەکاتێکدا ئامازەی بەلوتی کرد، وتی: "ئەمە غروری رۆزفێلتە." هەموو شتێك دەتوانی لەڕوی ڕوخسارو جەستەوە دیاری بکەیت.

کاریگەرییو لێکدانەوەی یەکەمجار لەناو ناچێت. بۆچی؟ چونکە لەدنیای خێرا تێپەڕی ئەمڕۆدا هەر ساتێ لەلایەنی جیاوازەوە بۆمباران دەکرێین، بۆ ئەوەی لەدنیادا لێکدانەوەی خێرا بکرێت، بەسەر خەڵکیدا دەسوڕێتەوە، بۆیە هەرکاتێ

کەسانێك دیمانەتان دەکەن دەسبەجێ لێکدانەوەتان لەسەر دەکەن، ئەم وێنەیەی ئێوە زانیارییەکە دەدات بەدەستەوە کەماوەیەکی زۆر کەسانیتر دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە.

## بەرلەوەی بتوانیت ووشەیەك بدرکێنیت، جەستەتان هاوارێك دەکات:

ئایا پێدانی زانیارییەکانی ئەوان تەواوون؟ بەشێوەیەکی سەرسوڕ هێنەر وەڵام ئەرێیە. تەنانەت بەرلەوەی لێوەکانتان لێك بترازێنن و یەکەم وشە بێننە سەر زمانتان، جەوهەری ئێوە چۆتە نێو مێشکی کەسی بەرامبەرەوە، جۆری سەیرکردنی ئێوە جۆری جوڵە کردنتان زیاتر لە٨٠٪ لێکدانەوەی کەسانیتر لەسەر ئێوە دیاری دەکات. تەنانەت پێویستی بەیەك وشە نییە.

من لەزۆر وڵاتدا کارو ژیانم کردووە، کەمترین ئاشناییم لەتەك زمانی ئەواندا نەبووە بەمەش بێئەوەی وشەیەك ئاڵوگۆڕ بکرێت دیارو ئاشکرا بوو یەکەم لێکدانەوەی من لەسەر ئەوان دروستو بەجێ بووە، هەرکاتێ چاووم بەهاوکارنی نوێ کەوتووە، دەتوانم بڵێم ئەوان تاچ ئەندازەیەك لەگەڵ من هەڵسوکەتێکی دۆستانەیان هەبووە.چەندە خاتر جەم بوون. من ئەمە کتومت لەجوڵەو بزاڤی ئەوانەوە دەرك پێدەکەم. من خاوەنی کارامەیی خوێندنەوەی هەستەکان نیم، ئێوەش ئەمە دەزانن. چۆن؟ چونکە بەرلەوەی دەرفەتێکت هەبێت تاکو شرۆڤەی ئەندێشەیەکی لۆژیکی بکەیت دەربارەی کەسێك پەنا بۆ هەستی شەشەم دەبەیت، توێژینەوەکان دەیسەلمێنن کاردانەوە هەستیارییەکان تەنانەت بەرلەوەی مێشك بتوانێت کاردانەوەکان تۆمار بکات شێوەی دەرەکی بەخۆیەوە دەبینێت، لەم ڕووەوە دروست لەو کاتەی کەسێك لێت ورد دەبێتەوە، چەن زانیارییەکی دەسدەکەوێت کەپێگەی پەیوەندیتان دیاری دەکات. باب، دەیوت لەکێشانی کاریکاتۆرەکانیدا، ئەم لێکدانەوە سەرەتاییە دەدۆزێتەوە.

من دەربارەی ئەم کتێبەی ئێستا لەبابم پرسی: "گەر بتەوێ وێنەی کەسێ بەجوانی بکێشیت دەبێت دەربارەی هۆش، کاریزما، خولیاو حەزی ئەم زانیاریت هەبێت." باب، قسەکەی بڕیم: "زۆر ئاسانە. حاڵەتێکی باشتری پێدەدەم، سەری کەهەڵبڕیوە، خەندەیەك لەڕوی متمانەو دڵنیایی سەرنجێکی ڕاستەوخۆو تێرامان." ئەمە وێنەی خوازراوی کەسێکە بۆخۆی کەس بێت.

## چۆن بۆ خۆتان کەسێك بن:

هاوڕێم کارن لەکاری مۆبێلسازی ماڵدا خاوەنی پیشەیەکی نایابە. مێردەکەی لەبواری پەیوەندیدا چالاکی دەنوێنێتو ئەوان خاوەنی دوو کوڕی بچوکن. هەر کاتێ کارن لەبەرنامەیەکی دروستکردنی موبیلیاتی ماڵدا ئامادە دەبێت، هەموو سەیری دەکەن. ئەو کەسێکی گرنگە لەم دنیایەدا. هاوکارانی هەوڵ دەدەن لەگەڵ ئەودا هاوڕابن.

بەمەش کارن گلەیی هەیە کاتێ مێردەکەی خەریکە لەبەرنامەیەکی پەیوەست بەپەیوەندیەکان هاوڕایی بکات، کەس گوێی پێنادات، کاتێ ئەو منداڵەکانی لەبەرنامەیەکی قوتابخانەدا هاوڕایی دەکات، دایکێکە وەك هەموو دایکانیتر. جارێك لێی پرسیم: "لیل، چۆن بتوانم لەنێو کۆمەڵێکدا کەمن ناناسن خۆم وانیشان بدەم ئەوان بزانن من کەسێکی نایابم؟" ڕەوشی ڕاسپاردەکراو لەبەشی ئەم کتێبەدا دروست ئەم ئەرکە ڕوون دەکاتەوە، کاتێ تۆ ڕەوشی دواتر دەخوێنیتەوە ڕوبەڕوی هەر کەسێك دەبیتەوە دەتوانیت کەسێکی تایبەت بیت، دەتوانی لەنێو هەر کۆمەڵێکدا سەر هەڵبڕیت. تەنانەت ئەگەر ئەو کۆمەڵە سەر بەتۆش نەبن.

بوار بدەن بەبزەی ئێوەوە دەست پێ بکەم.

## ١ ☆

## چۆن دەتوانیت بەشێوەی ئەفسوناوی
## سوود لەبزەی خۆت وەرگریت؟

لەساڵی ١٩٣٦، یەکێ لەبابەتەکانی شەش دانگەکە مایەی ئامازەی دیل کارنگی لەکتێبی یاساکانی هاوڕێگرتندا بزە کردن بوو. دوای ئەو هەموو ساڵە ڕێبەران و پسپۆڕانی کاری پەیوەندیەکان هەرکە پێنوسیان دەخستە سەر کاغەز یان لەهەمبەر میکرۆفۆندا دەوەستان، ئەم پرسەیان دەڕاستاند، بەلام بەدەسپێکی هەزارەی نوێ پێویستە دەبارەی زەردەخەنە لەپەیوەندی ئاستێکی باڵا شرۆڤەی زیاتر بکەین. کاتێ سەرنج لەوتەکانی دیل کارنگی دەدەین. دەبینین بزەیەکی خێرای جێگەی ڕامانی ئەو لەساڵێ ١٩٣٦، هەمیشەو بەتایبەت لەسەردەمی ئەمڕۆدا هێندە کاریگەری نییە.
بزە کردن بەشێوەی کۆن لەسەر کۆمەڵێکی گەلێك ئاڵۆزی ئەمڕۆ جەوهەری خۆی لەدەستداوە. لەڕێبەرانی دنیا کەسە بەهێزو سەرکەوتوەکانی کۆمپایناکان ڕامێنن، هیچ کاتێ بزەیەك لەوانەوە نابینیت، ئەکتەرو ئەستێرە ناودارەکانی بوارە جیاوازەکانی ژیان خەندەکانی خۆیان هێندە دەوڵەمەندو سەرشار دەکەن تاکو دنیا بەکارەساتی ئەوان پێ بکەنێت.
توێژەران سەرنجی چەندین جۆر زەردەخەنەیانداوە، هەندێ لەخەندەکان گەرم و هەندێکی دیکەیان ساردو سڕ. پاشان ڕوبەڕوی خەندەی ڕاستی و خەندەی درۆینە دەبینەوە، بەلام براوە مەزنەکان دەزانن خەندەی ئەوان

یەکێکە لەبەهێزترین ئەو چەکانەی لەبەر دەستیانەو هەوڵدەدەن بەباشترین شێوە بەکاری بێنن.

## چۆن زەردەخەنەی خۆمان خوازراو بکەین؟

ئەم سالانەی پێشوو یەکێ لەهاورێکانی سەردەمی کۆلێژم، بەناوی میسی، ئەرکی چالاکی بازرگانی خێزانەکەی لەئەستۆ گرت. کاری ئەوان ئامەیە بۆ وەبەرهێنەران پاکەتی مەبەستی خۆیان دروست بکەن، رۆژێکیان تەلەفۆنی بۆ کردمو وتی دەیەوێ بێت بۆ نیویۆرک بۆ پێکهێنانی بازرگانیەکەی بازارپسازیی بکات، باشان دەعوەتی کردم لەگەڵ چەندێك لەموشتەرییەکانی لەئێوارە خوانێکدا پێکەوە نان بخۆین، گەلێك بەپەرۆش بووم ئەم هاورێ نێرینەم ببینمو چێژ لەبزەو خەندەکانی ببینم.

ساڵی دواتر کاتێ باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەو پێی وتم بازرگانی بنەماڵەکەی لەئەستۆ گرتووە، بەخۆمم وت کەسایەتی میسی بۆ لەئەستۆ گرتنی بەڕێوەبەرێکی کارای کۆمپانیایەك هێندە گونجاو نییە.

ئەو لەگەڵ سیان لەموشتەرییەکانیو من چووینە چێشتخانەیەکی ناوەڕاستی شار، میسی بەهێواشی چپاندی بەگوێمدا: " تکایە ئەمشەو بەملیسا بانگم بکە." منیش بەهێواشی وەلامم دایەوە: " بەڵێ، هەڵبەت بەدەگمەن بەڕێوەبەرێك هەڵدەکەوێ ناوی میسی بێت." دوای ئەوەی خزمەتچیو گارسۆنەکان ڕێنماییان کردین بۆ مێزەکەمانو دانیشتین، من گەشتمە ئەم ئاکامەی کەملیسا لەگەڵ ئەو کچەی لەکولێژ دەمناسی زۆر جیاواز بووە، بەلام بەلامەوە سەخت بوو گۆڕانکاری تایبەت جیا بکەمەوە.

ملیسا لەگەڵ موشتەرییەکانی گەلێك گەرم‌و گوڕ دەدواو دیار بوو کەئەوانیش لەجۆری هەڵسوکەوت کردنی ڕزای بوون، منیش بەوە خۆشحاڵ بووم دەمبینی هاوڕێکەم ئەوانی بەزاندووە، لەکۆتایی نانخواردنەکەدا ملیسا سێ موشتەری گەورەی لەدلو خستبوو.

پاشان، کاتێ لەتاکسیەکدا تەنها هەردوکمان بوین وتم: "میسی، لەو کاتەوەی بەرپرسێتی کۆمپانیات لەئەستۆ گرتووە. گەلێك گۆڕاویت، کەسایەتیت گۆڕاوە، تەواو خوێنساردو ئەهلیی مامەڵەیت."

ئەو لەوەڵامدا وتی: "تەنها یەك گۆڕانم هەیە."

"چ شتێك؟" "زەردە خەنەکانم گۆڕاوە."

من بەسەرسوڕمانەوە لێم پرسی: "چ شتێکت گۆڕاوە؟"

وەك بڵێی پێشتر گوێم لەو قسەیەی نەبوبێت وتی: "زەردە خەنەکانم. کاتێ باوکم نەخۆش کەوت‌و دەیزانی چەن ساڵێکی دیکە دەبێت ئەرکی بەڕێوەبردنی کۆمپانیا لەئەستۆ بگرم، قسەی لەگەڵ کردم. قسەکانی ئەو سەرلەبەری ژیانی گۆڕیم. من هەرگیز قسەکانی فەرامۆش ناکەم. ئەو وتی: "میسی، ئازیزەکەم ئەگەر دەتەوێ لەکاری دروستکردنی پاکەتدا سەرکەوتو بیت، دەبێت بزانی خەندەکانت لەڕادەبەدەر خێران!

"پاشان گۆڤارێکی لەچەکمەجەی مێزەکەی دەرهێنا تاکو ئەو ڕیپۆرتاژەی مارەیەك بوو هەڵیگرتبوو لەکاتێکی گونجاودا بۆ خوێندنەوە بیدات بەمن، نیشانیدام. باسەکە لەسەر ژنان لەکارداو بازرگانی بوو. لەڕیپۆرتاژەکەدا هاتبوو ژنانێك لەژیانی پیشەی بازرگانیدا هەمیشە بزەیەکی شێنەیی لەسەر لێوانیان بێت شکۆیەکی زیاتر بەدەست دێنن".

لەکاتێکدا میسی قسەی دەکرد کەوتمە بیری ژنانی بەرجەستەی وەک مارگرێت تاتشر، ئاندێرا گاندی، مارلین ئۆلبرایت، ئەمانە هیچ کامێکیان بزەیەکی خێرایان نەدەکرد.

میسی بەردەوام بوو: "لەڕیپۆرتاژەکەدا نوسرابوو خەندەیەکی کراوەو گەرم لەحوکمی دارلییەکدایە بەڵام بەو مەرجەی کەمێ شێنەیی‌و ئارامتر شێوەی ڕاستی بەخۆیەوە ببینێت چونکە لەم کاتەدا شکۆ بەدی دێنێت." میسی ڕوونی کردەوە لەو ساتە بەدواوە، زەردەخەنەی گەش دەبەخشێت بەهاوکارانو موشتەرییەکانی، بەڵام هەوڵ دەدات لێوەکانی کەمێ درەنگتر خەندەکە نمایش بکات. بەم هۆیەوە خەندەکانی لەسەر کەسی بەرامبەر کاریگەریی بەتین بەجێ دەهێڵن.

باسەکە بەم سادەییە بوو. خەندەی شێنەییتری میسی بەکەسێتی ئەو قووڵیو هەڤڕەنگی‌و هاودڵیی زیاتری پێدەبەخشێت‌و کەسێ وەرگری ئەو خەندەیە بێت لێکدانەوەی باشتری بۆ دەکات.

بڕیارمدا لەبواری زەردەخەنە کردن شرۆڤەی زیاتر بکەم، کاتێ بۆ کڕینی جوتێ پێڵاو دەچیتە بازاڕ، سەیری قاچی خەڵکی دەکەیت. کاتێ بڕیار دەدەیت ڕەنگی ئارایشی قژت بگۆڕیت سەرنجی جۆری ڕەنگی قژی کەسانیتر دەدەیت. منیش تاچەن مانگێك لەخەندەی کەسانیتر ورد بوومەوە، لەو بزەو خەندانەی لەشەقامەکاندا دەمبینین چڕ دەبومەوە، لەتەلەفزیۆندا سەرنجی زەردەخەنەکانم دەدا، زەردەخەنەی سیاسەتمەداران، ڕۆحانیەکان، بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا زەبەلاحەکان، ڕێبەرە جیهانیەکان ورد دەبومەوە، گەشتمە ئەم ئاکامەی کەزەردەخەنە کاتێ کارساز دەبێت کەشێنەییتر شێوە بگرێت من ناوی ئەم زەردەخەنەیەم ناوە "خەندەی نوورقم بوون".

تەکنیکی ژمارە ١

کاتێ تووشی کەسێك دەبێت، دەسبەجێ بزەیەکی بۆ مەکە، لەجیاتی ئەوە ساتێك لەڕوخساری سەرنج بدە. وچانێك بدە. لەحاڵەتی ڕوخساری ڕامێنە. پاشان بوار بدە خەندەیەکی گەورەو گەرم لەڕوخسارتان بنیشێت تاچاوەکانتان لەخۆیدا نوومق بکات، ئەم خەندەیە بۆ کەسی دوێنەری ئێوە کاریگەریی بەتینی دەبێت. بەمجۆرە ئەوان وادەزانن خەندەی ئێوە تەنها ئەوانی کردۆتە ڕوانگە.

لێرەدا مۆڵەت بدەن لایەنێکی گرنگتر بگرینە بەر، دوو ئامرازی گرنگت لەبەردەستدایە، ئاماژەی من بەچاوەکانی ئێوەیە.

٢

## چۆن دەتوانیت بەچاوەکانت هەستێکی باشتر بەکەسانیتر ببەخشیت

ڕەنگە زیادەڕۆیی بێت ئەگەر بڵێم هیلینی پاڵەوان دەیتوانی بەچاوەکانی کەشتییەکان بخاتە نێو ئاوو دیڤی کروکت دەیتوانی بەچاوتێبڕین بەرازی نێرە هێور بکاتەوە، چاوەکانی ئێوە ئامرازێکی گەلێك گرنگن‌و توانای ئەوەیان هەیە سەرنجی کەسانیتر بەرەو ئێوە کێش بکات. دروست هەروەك ئوستادانی هونەرەکانی جەنگ لەدەستەکانی خۆیان وەك چەکێکی کوشندە بەکاری دێنن، ئێوە دەتوانن چاوەکانتان وەك چەکێکی بەهێز بەکاربێنن بەمەرجێ بەو شێوەیەی ڕوونی دەکەمەوە بتوانن جڵەوی بکەن.

کەسانی سەرکەوتوو لەیاری ژیاندا تەنها بەم ووتە کۆنەی دەڵێت: "پەیوەندی چاوەکان بەرقەرار بکە" کارێکیان نییە، ئەوان دەزانن بۆ هەندێ کەسی بەگومان‌و ڕاڕا چاوبڕینە چاویان دژوارییەکی دوژمنانەیە.

لەسەردەمی گەشەو باڵق بوونی خۆمدا کارەکەرێکی خەڵکی هایتی لەماڵەکەماندا کاری دەکرد هەرگیز ئامادە نەبوو لەگەڵ ئەو پشیلەیەی ناومان لێنابوو لویی بەتەنیا بمێنێتەوە. زولا دەیوت: "لویی، لەچاوەکانم دەڕوانێت دڵو دەروونم دەخوێنێتەوە."

لەهەندێك لەفەرهەنگەکاندا چاو لەچاو بڕین بەجۆرێك لەڕیزی جادوگەری هەژمار دەکرێت، لەهەندێکیتردا چاو لەچاوبڕینی کەسانیتر نیشانەی بێ

ئەدەبی و بێ ڕێزییە، بەپەیبردن بەمەش ئەستێرە ناودارەکان لەمەیدانی نێونەتەوەیی لەو باوەڕەدان لەکیفەکەیاندا کتێبیان دەربارەی داب و نەریت و فەرهەنگی جیاواز پێیە. بەڵام لەفەرهەنگی ئێمەی ناممۆدا براوە گەورەکان دەزانن بەرقەراریی چاو تێبڕینی بەتین دەتوانێ تاڕادەیەکی زۆر بەسودی ئەوان بێت، لەبازرگانیدا کەبۆنی عەشق و عاشقی لەئارادا نییە چاوتێبڕینی بەتینی نێوانی ژنان و پیاوان کاریگەریی بەتینی دەبێت.

لەبۆستۆن، بۆ زانیاری زیاتر لەچاوتێبڕین توێژینەوەیەکی فراوانکرا، توێژەران لەکەسانی دژە ڕەگەزیان داواکرد دوو خولەك پێکەوە بدوێن، لەنیوەی بەشداربوانیان داواکرد هێندە چاو ببڕنە چاوی یەکتریی بتوانن چاوتروکانی یەکتریی ببژێرن. لەنیوەکەیتر لەم توێژینەوەیەدا دەبارەی چاو تێبڕین هیچ شتێکیان پێنەوتن.

لەمیانەی ئەم توێژینەوەیەدا ئەوانەی چاوتروکانەکانیان هەژمار کرابوو وتیان دەربارەی ئەو کەسەی چاوی تێبڕیوون هەستی ڕێزێکی زۆر دەکەن.

جارێك لەسیمینارێکدا کەبۆ سەد کەسم ساز دەکرد. ڕوخساری ژنێك لەنێو بەشداربوودان سەرنجی منی بۆخۆی کێشکرد. دۆخی ڕواڵەتی هێندە لەگەڵ ئەوانیتردا جیاواز نەبوو بەڵام لەتەواوی ماوەی لێدوانەکەمدا سەرنجم بۆ لای ئەو کێش بوبو ئەو تەنانەت بۆساتێك چاوی لێنەتروکاندم، تەنانەت کاتێ خاڵێکم ڕوونەدەکردەوەو قسەکەم تەواو دەبوو دوبارە چاوی تێدەبڕیمەوە ئەم ڕەفتارەی ئەو کاریگەری لەسەرم هەبوو. لەژێر کاریگەری و نیگای چڕی ئەودا. ئەو وشانە دەکەوتنەوە بیرم کەماوەیەك بوو بیرم چوبونەوە.

لەکۆتایی لێدوانەکەدا ویستم ئەو کەسەی تائەم ئەندازەیە سەرنجی لەمن و لەقسەکانم داوە زیاتر بیناسم. هاوکات ئامادەبوان کۆڕەکەیان بەجێ هێشت و

منیش لێی نزیك بوومەوە وتم: "ببورە خانم" بەڵام ئەو بێ گوێدانە ئەم قسەیە لەڕۆشتنی خۆی بەردەوام بوو. بۆ دووەمجار قسەکەم دوبارە کردەوە بەڵام ئەمجارەش هیچ کاریگەرییەکی نەبوو. کاتێ لەهۆڵەکە چویە دەرەوەو گەشتە ڕێڕەوەکە بەدوایدا ڕۆشتمو ئەمجارە بەدەنگێکی بڵندتر بانگم کرد، بەسەرسوڕمانەوە سەیرێکی کردم. پێم ووت لەو سەرنجو ڕامانەی لەسەر منو قسەکان هەیبو سوپاسی دەکەم. بەسەرسوڕمانەوە لێی ڕوانیم. پێم ووت ئەو سەرنجو تێڕامانەی دەربارەی قسەکانم هەتبوو سوپاسی دەکەم دەمەوێ چەن وشەیەك لەمبارەیەوە لەگەڵی بدوێم.

وتم: "ئایا لەم سیمینارە سودێکی ئەوتۆتان بینی؟"

ئەو ڕاستگۆیانە وتی: "نا، هێندەش نا، سەرنجی قسەکانتم نەدەدا، تۆ لەشوێنی لێدوانەکەوە بەردەوام دەڕۆشتیتو سەیری شوێنە جیاوازەکانت دەکرد." دەسبەجێ هەستم پێکرد. ئەم ژنە کەڕ بوو، بەپێچەوانەی بۆچونی منەوە سەرنجی ئەووم کێش نەکردبوو بەپێچەوانەی مەیلی منەوە لەقسەکانیشم نەهەژابوو، تەنها هۆکارێکی ئەوەی هێندە چاوی تێبڕیووم ئەمە بوو بەڵکو بتوانێ لەڕێی تێڕامانی قووڵەوە لێوەکانم بخوێنێتەوە.

بەمەش سەرنجەکەی ئەو هێندە کاریگەرییەکی بەتینی لەسەر من دانا سەربارێ ماندوێتی پێم وت دەتوانم یەك کاتژمێری کرۆکی سیمینارەکەی بۆ باس بکەمو هەر ئەو کارەشم کرد. چاوتێبڕین خاوەنی هێزێکی باڵایە.

## چاوەکانتان تیژ تر بکەن:

بۆ دانانی پەیوەندی چاو، خاڵێکی دیکە هەیە دەبێت سەرنج بدرێت. چاوتێبڕین وێڕای ئەوەی ڕێزو خۆشەویستی دەردەبڕێت لەلایەنی بەرامبەریش ئەم

لێكدانەوەیە دروست دەكات تۆ بیرسایەكی نایابیت. كەسەكان بەم تیبەتمەندیە بەئاسودەیی زیاترەوە زانیاریەكان وەردەگرن. ئەم جۆرە كەسانە تەنانەت لەبێدەنگیشدا دەتوانن لەچاوەكانی كەسێك رامێنن.

توێژەرانی زانكۆی ییل توێژینەوەیەكیان ئەنجامدا تاكو بیسەلمێنن پەیوەندی چاو زیاتر هەستی ئەرێنی دەهەژێنێت، ئەمجارە دوایان لەبەشداربوانی توێژینەوەكە كرد زانیاری دوورودرێژ دەربارەی خۆیان باس بكەن پاشان داوایان لەلایەنی بەرامبەریان كرد چاویان تێبڕن.

بەڵام چ ئاكامێكی هەبوو؟ كاتێ ژنان حیكایەتەكانی تایبەتی خۆیان بۆ ژنەكانی دیكە دەگێڕایەوە، توێژەران گەشتنە ئەو ئاكامە كەپێش بینیان كردبوو. بەرزكردنەوەی پەیوەندی چاو هەستی هاودڵیی لەواندا بەرزكردەوە بەڵام دەربارەی پیاوان بەوجۆرە نەبوو، هەندێ لەپیاوان بەوەیكە ماوەیەكی درێژ پیاوێك چاو لەچاوی ببڕێت ڕەفتاری دوژمنایەتیان دەنواند هەندێكیش هەستی ئەوەیان دەكرد هەڕەشەیان لێدەكرێت.

كاردانەوەی هەستیاری لایەنی بەرامبەر بەتۆ بەچاوتێبڕینی تۆ لەچاوەكانی یەك تەلاری بیولۆژیای هەیە. كاتێ بەخواستو ویستی خۆت نیگای كەسێك دەكەیت لێدانی دڵی كەسی بەرامبەر بەرەو باڵا دەبەیتو هۆكاری ڕژاندنی مادەی ئەدرنالین دەبن لەخوێنی ئەو كەسەدا. ئەمەش هەمان كاردانەوەی فیزیكیە كاتێ كەسەكان عاشق دەبن دەریدەبڕن، كاتێ تۆ ئاگایانە چاوتێبڕینی خۆت بەرەو باڵا دەبەیت، كەسانیتر لەكاتی جیاوازدا وادەزانن هاوبیروڕایی تۆیان كێش كردووە.

☆ **تەکنیکی ژمارە ٢**

**چاوانی چەسپاو**

**وایدابنێ کەچاوەکانی تۆ چەسپیوە بەو کەسەی لەگەڵیدا دەدوێیت، تەنانەت ئەو کاتەی قسەکانی تەواو دەکات تۆ چاوی خۆی لێ مەتروکێنە. کاتێ تۆ چاوی تێدەبڕیت ئەم کارە بەئارامی ئەنجام بدە.**

**بەڵام چاوانی پیاوان**

بەڕێزان کاتێ لەگەڵ پیاوێکی دیکە دەدوێیت دەتوانێ لەڕەوشی چاوانی چەسپیوو سوود وەرگریت، کاتێ لەگەڵ پیاوێك باسی مەسەلەیەکی تایبەتی دەکەن، لەتینی چەسپیوی چاوت کەم بکەرەوە، بەڵام کاتێ دەربارەی پرسەکانی ڕۆژانەو کارێك دەدوێن دەتوانی زیاتر چاوی تێبڕیت.

هاوڕێیەکی فرۆشیارم هەیە بەناوی سامی کەناخواستە کەمێ خۆبەزلزان دەردەکەوێ، مەبەستێکی نییە بەڵام هەندێجار وادەردەکەوێ لەڕووبەڕووبەنەوەی هەستی کەسانیتردا زبر بێت.

جارێك پێکەوە بۆ ئێوارە خوانێك چوینە چێشتخانەیەك دەربارەی چاوانی چەسپاو، قسەم لەگەڵ کرد، وابزانم بەچاکی دڵیی دایە باسەکە، کاتێ گارسۆنەکە هات بۆلامان. سامی لەجیاتی عادەتی هەمیشە لەکاتێکدا سەیری خواردنەکان دەکەیت داوای خواردنەکەی بکات، بزەیەکی کردو سەرنجێکی گارسۆنەکەیدا سەرەتا پێش ئەوەی دوای خواردن بکات پاشان سانێکێز لەچاوەکانی وردبویەوە سەرلەونوێ چاوێکی بەلیستی خواردنەکاندا گێڕایەوە

تاکو داوای خواردنەکە بکات، ناتوانم پێتان بڵێم سامی لەو ساتەدا چەند لەبەرچاوی من جیاواز بوو ئەو وەك پیاوێکی بەسەرنجو هەستیار دەرکەوت. تەنها کارێك کردبوی دوو چرکە چاو تێبڕین بوو. کاریگەریی ئەم سەرنجدانە لەڕوخساری گارسۆنی چێشتخانەکەدا بینی ئەو شەوە خزمەتێکی زۆر جوانم لەو گارسۆنە بینی.

هەفتەیەك دوای ئەوە سامی تەلەفۆنی بۆ کردم وتی: لیل، چاوانی چەسپیو ژیانی گۆڕیم. لەو کاتەوەی بەگوێی ئامۆژگارییەکانی تۆم کردووە هەموو بەشێوەیەکی دیکە ڕەفتارم لەگەڵ دەکەن. ئەم هەفتەیە بەبەراورد لەگەڵ جاران فرۆشێکی زیاترم هەبووە!"

ئەگەر ئێوە لەژیان و کارەکانتاندا لەگەڵ موشتەری و سەرۆکەکانتان ڕوبەڕو دەبنەوە بێگومان لەڕوشی چاوانی چەسپیو سودمەند ببن، چاوبڕینە چاوی کەسانیتر بڕواو متمانەی ئەوانتان بۆ مسۆگەر دەکات بەوان ئەم هەستە دەبەخشیت کە "من لەخزمەتی تۆ دام."

بازیاتر لەچاوانی چەسپیو سوودمەند بین، ئەم ڕەوشە لەحوکمی دەرمانێکی چارەساز یان کوشنەدا خۆی دەبینێتەوەو پرسێکە لەبەشەکانی دواتردا زیاتر دەیخەینە ژێر ڕوماڵکردنەوە.

## ٣

# چۆن چاوەکانت بەکار دێنیت
# تاکو کەسێك شەیدای خۆت بکەیت

ئێستا باس لەڕەوشێك دەکەین کەناووم ناوە "چاوانی ئیپۆکسی".
سەرۆك‌و گەورە بەرپرسەکانی سوپا زیاتر بۆ هەڵسەنگاندنی کارمەندەکانیان لە"چاوانی ئیپۆکسی" سوود دەبینن. هێزەکانی پۆلیس‌و لێکۆڵەران بۆ دۆزینەی تاوانباران ئەم ڕەوشە بەکار دێنن.
لەڕەوشی چاوانی ئیپۆکسی دەبێت لانیکەم سێ کەس ئامادە بن، تۆ، ئامانجەکەی تۆ، کەسێکی دیکە، جۆری سوود بینین لەم ڕەوشە بەمجۆرەیە، هەمیشە کەلەگەڵ کەسێك یاچەن کەسێکدا دەدوێیت چاو دەبڕیتە ئەو کەسی کەقسە دەکات، بەڵام ڕەوشی چاوانی ئیپۆکسی دەڵێت سەرنجی ئەو کەسە بدە کەدەدوێت، لەراستیدا سەرنجی ئامانجەکەت دەدەیت نەك ئەو کەسەی قسە دەکات. ئەم هەنگاوە ئامانج دێنێتەوە بیر کە "چۆن ئەم کەسە لەجیانی ئەوەی سەیری قسەکەر بکات سەیری من دەکات؟" ئەو هەست دەکات تۆ بەکاردانەوەکانی ئەو حەزێکی تایبەتت هەیە. ئەم کارە دەتوانێ لەهەندێ دۆخی بازرگانیدا بەسوود بێت. بەتایبەت کاتێ بتەوێ دەربارەی کەسێك قسە دەکات دادڤانی بکەیت.
پسپۆڕانی سەرچاوە مرۆییەکان زۆرتر لەڕەوشی "چاوانی ئیپۆکسی" سوود دەبینن بەڵام نەك وەك تەکنیکێك بەڵکو بەو بەڵگەیەی دەیانەوێ کاردانەوەی

تایبەت سەبارەت بەهەندێ لەخاڵە سەرنجەکان بزانن، بریکار، سەرۆکەکان، لێکۆڵەرانی پۆلیس، دەروونناسان و زۆرێك لەو کەسانەی کەدەبێت کاردانەوەی کەسانیتر ڕاڤە بکەن بۆ توێکاری کەسەکان سوود لەم ڕەوشە دەبینن.

کاتێ سوود لەڕەوشی چاوانی ئیپۆکسی دەبینیت. نیشانی دەدەیت هەم ئاگات لەکەسی مەبەستە هەم خاوەنی متمانەو دڵنیابونیت. بەڵام لەو جێیەی ئەو ڕەشە بتانخاتە دۆخێکەوە دادڤانی کەسێك بکەن. دەبێت دیقەتی تەواوت هەبێت. ئەگەر لەڕادەبەدەر ئەم کارە بکەیت دەبیتە کەسێکی خۆبین و خۆبەزلزان.

> ☆ **تەکنیکی ژمارە٢**
>
> **چاوانی ئیپۆکسی**
>
> ئەم ڕەوشە خاوەنی کاریگەرییەکی بەهێزە. تەنانەت کاتێ کەسێکیتر دەدەوێت سەرنجی ئامانجەکەی خۆت بدە. بێ گوێدانە ئەوەیکە کێ قسە دەکات، سەرنجی ئەو کەسە بدە کەدەتەوێ کاریگەری لەسەر بکەیت.

٤

## چۆن بچیتە هەر شوێنێك
## وەك براوەیەك دەركەویت

دەبێت كارێك بكەیت كەسەكان لەو ساتەدا كەسەیرت دەكەن وەك كەسێكی سەركەوتوو بتبینن. بۆ گەیشتن بەم پلەیە، گرنگترین ڕەوشتێك كەهەمان بێت بۆتان باس دەكەم تاكەسێكی نایاب دەركەویت.

كاتێ پزیشك بەو چەكوشە بچوكەی لەئەژنۆی تۆ دەدات قاچت بەرەو پێش هەڵدەگەڕێتەوە، ئەمە بەكاردانەوەی ئەژنۆ هەژمار دەكرێت. بەڵام جەستەی تۆ خاوەنی كاردانەوەیەكی بەرجەستەترە، كاتێ هەواڵێكی خۆش دەبیستیت هەستی براوەیی دەكەیت، سەرتان خۆ بەخۆ بڵند دەبێت شانەكانت هەڵدەكێنیت بزە دەكەوێتە سەر لێوەكانت عەشق و خۆشەویستی لەچاوەكانت دەبارێت.

ئەمە ئەو سەیركردنەیە براوەكان هەمیشە لێی بەهرەمەندن. ئەوان بەخاترجەمییەوە دەوەستن بەخاترجەمییەوە هەنگاو هەڵدەگرن بزەیەكی گەش و بەغرور دەئەفرێنن. گومانێك لەمبارەیەوە نییە. حاڵەتی ڕێكی لەش نیشانەی ئەمەیە كەتۆ ژن یان پیاوێكی دەگمەن و نایابیت.

بۆ نمونە ملیۆنان دایك ئامۆژگاری منداڵەكانان دەكەن خۆیان كووڕ نەكەنەوە، ملیۆنان فێركار بەمنالان دەڵێن ڕێك و ڕاست بەڕێدا بڕۆن بەڵام بێسوودە،

بۆنـەوەی حاڵـەتێکی بـاش لـەخۆمان بنـوێنین پێویسـتمان بـەو ڕەوشـەیە کەباوکان‌و دایکان‌و فێرکاران دەیخوازن.

لەپیشـەیەکدا، هـەبوونی حاڵـەتێکی جەسـتەیی نـەك هـەر خـوازراوو گونجـاوە، بەڵکو مەسەلەی مردن‌و ژیان دیاری دەکات، جوڵەیەکی هەڵـە، کوورکردن‌و وێـك هێنانەوەی شانەکان، دیاردەیەکی لاواز، دەتوانێ هەڵەیەك بێنێتە ئاراوە.

هەرگیز ئەو یەکەمجارەی دایکم بردمی بۆ سێرك بیرم ناچێتەوە، کاتـێ حـەوت ژن‌و پیاو لەسەر سـەکۆکە دەسـتیان کـرد بـەڕاکردن، خەڵکـە لەشـوێنی خۆیـان هەسـتانە سـەرپێ دەسـتیان بەهانـدانی ئـەوان کـرد، دلیکـم دەمـی هێنایـە لای گوێمەوە وتی: "ئەمانە گرووپی والندان" ئەو ساتەی خەڵکەکە بێدەنگ بوو. هیچ دەنگێـك لەبینەرانـەوە نـەدەهات دەسـتەیەکی حـەوت کەسـیی بەسـەر گوریسێکەوە کەبە بەرزاییەکـەوە هەڵواسـرابوو بێئـەوەی شـتێك لـەژێرەوە بیـان پارێزێت لەگەڵ جوڵەیەکی ئاکرۆباتیکی نمایشیان دەکرد.

بەلای منەوە جوڵەی ئەو حەوت کەسە شتێکی سەیرو سەمەرە بوو، سەریان بـۆ سەرەوە شانەکانیان بەرەوخوار جۆرێك ڕێك‌و پێك وەستابوون وەك بڵێـی پێیـان لەسەر زەوی نەبوو، هەر ماسـولکەیەکی جەسـتەیان غـروورو شـانازی لێدەباری، نیشـانی دەدا ئـەوان زینـدوون‌و شـادن‌و چـێژێك دەبیـنن، لێـرەدا ڕەوشـی وێنەسـازیی بـاس دەکـەم تـاکو جەسـتەی ئێـوەش وەك براوەکـان دەرکـەوێ هەستی غروورو شانازی‌و سەرکەوتن‌و شادی لەژیاندا بکەن.

## حاڵەتی جەستەی ئێوە گەورەترین پێوەری سەرکەوتنی ئێوەیە.

وابزانـە بەنـدبازێکی بـەناوبانگی جیهانیـت. لەنمایشـێکی مەزنـدا چـاوەڕوانیت هونەرنمایی بکەیت، چـەن سـاتێکی دیکـە دەچیتە سـەر سـەکۆی نمـایش تـاکو

سەرنجی واق ورماوی بینەران دەربارەی هاوسەنگیو هەماهەنگی جەستەی خۆت کێش بکەیت.

بەرلەوەی بەهەر دەرگایەکدا تێپەڕ ببیت دەرگایەك دەگاتە نوسینگەی کارەکەت، دەرگایەك بۆ میوانییەك یان کۆڕێکی چاوپێکەوتن دەکرێتەوە یان تەنانەت دەرگایەك دەبێت لێوەی تێپەڕ بیت تاکو بگەیتە چێشتخانە، وایدابنێ چەرمێك لەسەرەوە شۆڕ کراوەتەوە دورییەکەی لەسەری تۆوە زیاتر لەیەك ئینج نییە، لەکاتێکدا بەدەرگایەکدا تێدەپەڕیت سەرت بۆ دواوە بێنیت، لێگەڕێ بزەیەك بنیشێتە سەر لێووت، وایدابنێ لەزەوی بەرز دەبیتەوە، سەرنجی ئاپۆرای ئەو خەڵکە دەدەیت کە زۆر بەتین واقیان ورماوە، جەستەت خاوەنی بەرز بونەوەیە، سەرت هەڵبڕیوە، شانەکانت بۆ دواوە، لەشێکی سووکو ڕێکو پێك وەك ئەوەی قورساییەکت نەبێت، خەڵکەکە لەدیتنی تۆ چێژ دەبینن، ئێستا بۆ خودی خۆت کەسێکیت.

ڕۆژێکیان بڕیارمدا ئەو کەڕەتانەی بەدەرگایەکدا تێپەڕ دەبم هەژماری بکەم، بینیم تەنانەت کاتێ لەبەردەگایماڵەوەم شەست جار بەو دەرگایەدا تێپەڕیووم، دووجار بۆ لەماڵ دەرچوونو گەڕانەوە شەش جار بۆ چوونە سەرئاو هەشت جار چوونە چێشتخانەوەو هاتنە دەرەوە، هەرکارێك ڕۆژی شەست کەڕەت دوبارە بێتەوە دەبێتە نەریت، هەبوونی حاڵەتێکی جوانی جەستە یەکەمین نیشانەی بردنەوەیە.

ئێستا خاوەنی ئەم ئامادەییەیت بەدەرگایەکدا تێپەڕە، بچۆرە ژوورێکەوە سەرنجی کۆمەڵێك ڕاکیشە. ئێستا هەموو شتێك بەردەستە تاوەکو براوەیەك دەرکەویت، هەڵو مەرجی دڵخوازی کەسێك کەبۆخدوی خۆی ئامادەییە ئەمەیە

حاڵەتی جەستەیی جوان، سەیرکردن بەشانازییەوە، برەیەک بەدڵنیاییەوە سەرنجدانی ڕاستەوخۆ بنوێنێت.

☆ تەکنیکی ژمارە٤

**خۆ هەڵواسین بەهۆی ددانەکانەوە**

وایدابنێ لەیارییەکی سیرکدایت ئاڵقەیەکی ئاسنی شۆڕکراوەتەوە، بەددانەکانت گاز لەو ئاڵقەیە بگرەو خۆتی پێدا هەڵواسە . کاتێ بەمجۆرە خۆت هەڵدەواسیت، هەریەک لەماسولکەکانت حاڵەتی کشانی بێ کەمو کورتی بەخۆیەوە دەبینێت.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ دەکەیت سەرنجی بدەیت. کارێك بکە ئەو خۆی بەگەورە ببینێت.

٥

## چۆن بەوەڵامدانەوەی مناڵەکەی دەرونی کەسانیتر هاوبیروڕایی ئەوان کێش بکەین

ئایا ئەو نوکتە کۆنەت بەبیر دێتەوە کەقۆشمەچییەك دێتە سەر سەکۆو یەکەم قسەی ئەمەیە لەئامادەبووان دەپرسێت، "زۆر باشە، تائێرەی بەرنامەکەتان بەدڵە؟" ئامادەبوان هەمیشە لەژێرەوە پێدەکەنن. بۆچی؟ چونکە ئێمە هەمیشە لەبێدەنگیدا ئەمە لەخۆمان دەپرسین. هەرکاتێ چاومان بەکەسێك دەکەوێ بەشێوەیەکی ئاگایانە یان نیوە هۆشیارانە دەزانین ئەوان چۆن کاردانەوە نیشانی ئێمە دەدەن.

ئایا لێمان دەڕوانن؟ ئایا خەندە دەکەن؟ ئایا مەیلیان لەئێمەیە؟ ئایا بەشێوەیەك دەزانن ئێمە چەندە دەگمەن و نایابین؟ ئێمە ئەوان دەناسین، سەلیقەیەکی جوانیان هەیە، یان ڕوی خۆیانمان لێوەردەگێڕن، نەکەوتونەتە ژێر کاریگەریی ئێمەوە.

کاتێ دوو کەس بۆ یەکەمجار یەکتریی دەبینن وەك بڵێی بۆنی یەکتریی دەکەن، ئێمە چاوانێکمان هەیە باریك و تیژە. لەو یەکەم ساتانەی کەپێکەوەین دەیان کاردانەوەی نەخوازراو لەخۆمان دەنوێنین.

بریکارەکان ئەمە باش دەزانن، ئەوان لەجوڵەی جەستەی تۆ جوان ورد دەبنەوە، ئەوان دیقەتی ئەمە دەدەن کەبە چ چۆنێتیەك وەڵامی پرسیارەکانیان

دەدەیتەوە، ئایا خۆت دەدزیتەوە؟ ئایا بێ باکانە قسە دەکەیت؟ ئەوان سەرنجی دەستەکانت دەدەن؟ ئایا لەحاڵەتێکی نارامیدا کراونەتەوە؟ لەپێ دەستەکانت بەرەو ژورە؟ یان کەمێ دەستەکانت مشت کردوون، نیشانی دەدەیت قسەکانی ئەوانت قبوڵ نەکردووە؟ سەرنجی ڕوخسارت دەدەن، ئایا کاتی قسەکردن چاوت لەچاویان بڕیوە؟ جاری وامەیە بریکاری داکۆکیکار لەگەڵ خۆیان هاوکارانێك بۆ کۆڕەکە دێنن کەلەنێو خەڵکیدا دادەیشن کاریان تەنها ئەمەیە حاڵەتی جەستەیی تۆ تۆمار بکەن.

خاڵێکی گرنگ: بریکاری داکۆکیکار زیاتر بۆ زانیاری لەحاڵەتی جەستەیی لایەنی بەرامبەر لەدادگاکان لەژنان سوود دەبینن. چونکە ئەم ژنانە زیاتر لەپیاوان دەتوانن زمانی جەستەو جوڵەی جەستەیی جیا بکەنەوە، ژنان بەبەراورد لەگەڵ پیاوان دەربارەی هەستەکان هەستیارترن، بەم هۆکارەشە بەئاسانی لەمێردەکانیان دەپرسن:"ئازیزەکەم، ئایا کێشەیەك دروست بووە؟" زۆرێك لەژنان گلەیی ئەوە دەکەن هاوسەرکانیان هەستیاری پێویستیان نییە ناتوانن لەهەستەکانی ئەمان تێبگەن.

بریکارو مافناسان لەگەڵ هاوکارەکانیان ئەو نیشانانەی دەیبرین بۆ زەمینی نیوە هۆشیار توێکاری دەکەن.

بریکارو مافناسەکان هێندە سەرنجی زمانی جەستە دەدەن کەلەدەیەی ١٩٦٠ لەدادگایی بەناوبانگی "شیکاگۆ بریکاری داکۆکیکاری ویلیام کانتسلر لەحاڵەتی جەستەیی قازیی جولیوس هافمن ڕەخنەی یاسایی گرت وتی لەمیانەی لێکۆڵینەوەکاندا ئەو پاڵی داوەتەوە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت حەزی بەبیستنی قسەکانی نەبووە.

دەچرکە زیاتر دەرفەتت نییە

دروست وەکو بریکاری داکۆکیکار دەبێت بڕیاربدەن ئایا دەیانەوێ فرمان بکەوون، چاووت بەهەر کەسێك دەکەوێ بەشێوەی نیوە هۆشیار بڕیار دەدەین ئایالەژیاندا خۆتت دەوێ یان ناتەوێ، پلانڕێژیی ئەوان تاڕادەیەك بەپێی زمانی جەستەی ئەوان بەم پرسیارە دەرناکەوێ کە: "زۆر باشە، تا چ ئەندازەیەك منت پێ باشە؟"

چەن ساتی یەکەم کاردانەوەکانی تۆ داخوازی پەیوەندی تۆ دیاری دەکات، ئەگەر لەئاشنایییەکی نوێ وەڵامی ئەرێت بوێت دەبێت وەڵامی پرسیارەکە: "تا ئێرە چەندێك منت بەدڵە؟" بێت: "بەڕاستی تۆم بەدڵە."

کاتێ منداڵێکی چوار ساڵان هەستی شەرمنی دەکات، دەستەکانی بەرەو سینەی بەرز دەکاتەوە خۆی لەپشت داوێنی دایکیدا دەشارێتەوە. بەڵام کاتێ جانیی بچکۆلانە دەبینێ باوکی هاتۆتەوە بەرەو لای ئەو ڕادەکات. بزەیەك دەکات، چاوەکانی کراوەو گەش دەبن دەستەکانی دەکاتەوە تاکو باوکی لەئامێزی بگرێت، جەستە حەزی لەمناڵێکی وەك خونچە گوڵە کەلە بەرهەتاو پشکوتوو بێت.

بیست، سیی، چل یان پەنجا ساڵ ژیانکردن لەسەر زەوی جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، کاتێ جانی تەمەن چل ساڵان لەشتێك دەترسێت یان شەرم دەکات دەستەکانی دەنێت سینەیەوە، کاتێ دەیەوێ نیدی یەکێ لەهاوکارە بازرگانەکانی یان فرۆشیارێك ڕەت بکاتەوە ڕوی لێ وەردەگێڕێت تاکو زمانی جەستەی نیشانی بدات چ جۆرە هەستێکی هەیە، بەڵام جانی گەورەیەو کاتێ دەچێتەوە بۆماڵەوە بەئامێزێکی کراوەی هاوسەرەکەی پێشوازی لێدەکرێ.

### تەکنیکی ژمارە ٥

### ڕەفتاری ژیرانە

بەهەرکەسێ ئاشنا دەبیت ڕەفتارێکی ژیرانەی لەگەڵ بنوێنە لەبەر ئەوەی یەکتری بناسن. پاداشتێك بدە بەکەسی تازە ناسراو. بزەیەکی بۆ بکە، بەهەموو وجودەوە سەرنجی بدە. کاتێ بەوپەڕی وجودی خۆتەوە لەگەڵ کەسێك دەدوێیت. لەڕاستیدا پێی دەڵێیت: " بەبڕوای من تۆ بونەوەرێکی زۆر تایبەتو جیاواز لەکەسانیتریت "

بزانن لەدەرونی هەر کەسێکدا منالێکی گەورە دەژی کەبەتین خوازیاری ناسینە. دەیەوێ بڵێت ئەو بونەوەرێکی تایبەتو جیاواز لەکەسانیترە.
لەباسی دوارت ڕونی دەکەمەوە ئەم منالەی دەرون دەیەوێ بیسەلمێنێت کرۆکی جیهانی وجود خودی خۆیەتی.

٦

## چۆن ئەو هەستە بدەین بەکەسانیتر
## ئەو هاوڕێی دێرینی ئێمەیە.

پیاوێکی دانا ناوێکی پێکەنیناوی "زیگ" ی هەیە سەردەمێك پێی وتم: " بەلای خەڵکییەوە گرنگ نییە تۆ چەن بزانیت. ئەمە گرنگە چەندە گرنگیان پێدەدەیت. زیگ زیگلار ڕاست دەڵێت. ئەگەر دەتەوێ کەسانیتر تۆیان خۆش بوێت نیشانی بدە تۆ ئەوانت خۆشدەوێت.
جەستەی تۆ لەماوەی بیستو چوار کاتژمێر زانیاری دەدات بەکەسانیتر کەلە چ کاتێکدا دەربارەی ئەوان بەسەری دەبەیت، بزانە زمانی هەموو جەستەی تۆ گرنگە، ڕەنگە سوودت لەئامۆژگارییەکانی ئێمە تائێرە وەرگرتبێت بەمەش زمانی جەستەی تۆ نیشانی دەدات حەزێکت دەربارەی ئەوان نییە. بەهەموو جەستەوە لەنوکی پێوە تاتەوقی سەر ئەگەر دەتەوێ بەکەسێکیتر بڵێیت من پەیوەستم بەتۆوە دەبێت بتوانی ئەم پەیامە بگوێزیتەوە.
مەخابن کاتێ چاوومان بەکەسێ دەکەوێ زەینمان لەدۆخێکی خوازراودا خۆی ناگرێت. ئایا کتێبی جولیوس سیزار شکسپیرت لەبیرە؟ ئەو دەربارەی کاسیوس دەڵێت: "نیگایەکی برسی هەیە... لەڕادەبەدەر بیردەکاتەوە...کەسانێك خاوەنی ئەم خەسڵەتە بن مەترسیدارن." کاتێ لەگەڵ کەسێکی نوێ دەدوێین زەینمان دەکەوێتە بارودۆخێکی بەمشێوەیەوە. هەندێکمان دەستەو یەخەی شەرم دەبین، هەندێکی دیکە دۆخەکە سوك و

ـەنگین دەکـەین. کۆمـەڵێکمان بپرسـین. لـەم تۆخـەدا لـەجیاتی ئـەوەی ڕەفتارێکی دۆستانە بنوێنین لەڕادەبەدەر وادەزانین. ئەمجۆری ڕوبەڕو بونەوەیە بۆ عەشق، خۆشەویستی‌و دەسپێکی پەیوەندییەکی مەترسیدارە.

## چۆن چاوەڕوانی کاری دروست لەجەستەمان بکەین:

لێرەدا بەڕەوشـێکی وێنەسـازیی ئاشـناتان دەکـەم بەهۆیـەوە دەتـوانی ببیتـە خاوەنی ئەم ئەرکە. ئـەم ڕەوشـە گرەنتـی دەدات لەگـەڵ هـەر کەسـێك بـدوێیت هەستی گەرمیی‌و هاودڵیی بکات. ناووم لێناوە "سڵاوی هاوڕێی دێرینە".

کاتێ کەسێك دەبینیت، یارییەکی زەینی لەگەڵ خۆتان ئـەنجام بـدەن. بەچـاوی زەین خودی ئەو بەیەکێ لەهاوڕێ دێرینەکان دەبینیت، کەسێك سـاڵانێك پێشـتر لەگەڵیدا پەیوەندییەکی بتەوت هـەبووە. بـەڵام بەشـێوەیەك شـوێن پێـی ئـەووت بیرچۆتەوە هەوڵێکی بەتینت داوە ئەم هاوڕێ دڵسۆزەت بدۆزیتـەوە بـەڵام نـاوی ئەووت لەدەفتەری تەلەفۆندا نەدۆزیوەتەوە. هیچ زانیارییەکت دەسنەکەوتووە، هاوڕێکەت‌و هاوسەرەکەشت نایانتوانیوە هاوکارییەکت بکەن.

بەڵام لەپڕو بەڕێکەوت هاوڕێی ساڵانی ڕابـوردوو دەدۆزیتـەوە. گـەلێك خۆشـحاڵ دەبیت.

لێرەدایە خۆدەرخستن دەوەستێت. بۆ نمونە بڕیار نییـە کـە کەسـی نـوێ ڕازی بکەیت هاوڕێ دێرینـەی یـەکترین، بڕیـار نییـە لـەئامێزی بگریـت ماچـی بکـەیت بڵێیـت: "لەدیتنـەوەی تـۆ خۆشـحاڵم. " یـان "چـەن سـاڵە لـەکوێ بویـت؟" لەدیتنەوەت خۆشحاڵم بەڵام لەناخی تۆدا شتێکی دیکە بەڕێوەیە.

خۆتان سەرسام دەکەن خۆشحاڵیەکەتان لەسەر زمانی جەستەتان کاریگەری دەنوێنێت. کارێك دەکەیت ئەم کەسە نوێیە هەستی ئەوە بکات کەسێکی تایبەتە.

☆ **تەکنیکی ژمارە ٦**

**سڵاو هاوڕێی دێرین**

**کاتێ چاووت بەکەسێك دەکەوێ. وابزانە ئەو هاوڕێیەکی دێرینەی تۆیە. دەستی بەدی ڕۆژگار لەیەکتریی دابڕیوون. بەڵام ئیستا لەم دیدارە یان لەم میوانییە بینەوەی هەواڵێکی پێشینەت هەبێت چاووت پێی دەکەوێت.**

**ئەم ئەزمونی شادیئامێزە دەبێتە هۆی زەینی نیوە هۆشیاری تۆ لەسەر جەستەی تۆ کاریگەری هەبێت. لەبرۆکانتەوە بیگرە تاکو نوکی پێت کاریگەری دەبێت و کاریگەریش لەسەر کەسی بەرامبەر بەجێ دێڵێت.**

لەسیمینارەکانمدا داوا لەئامادەبوان دەکەم هەر کەسێکیان خۆیان بەکەسێکی تریان بناسێنێت. دیارە لەم قۆناغە هێشتا تەکنیکی سڵاو هاوڕێی دێرینەم فێر نەکردوون.

کەسەکان پێکەوە دەدوێن. پاشان داوایان لێدەکەم هەرکەسێکیان خۆی بەم گریمانەیە بەکەسانیتر بناسێنێت کەهاوڕێی دێرینەی یەکترین. ئێستا زۆرێکی ژیان و کەشێکی نوێ دێتە ئاراوە. جیاوازی ئەم دوو یەکتر ناسینە ئاسمان و ڕێسمانە. نزیکتر لەیەکتریی پێکەوە دەدوێن لەناخەوە پێدەکەنن.

**تەنانەت پێویستی بەدەربڕینی یەك وشە نییە:**

تەکنیکی سڵاو هاوڕێی دێرینەم تەنانەت پێویستی ئاخاوتن ڕەت دەکاتەوە، هەرکاتێ سەفەر بۆ وڵاتێکی بیانی دەکەیت کەلەزمانیان نێناگەیت. ئەم ڕەوشە بەکاربێنە. ئەگەر لەنێو کۆمەڵێکدا بویت هەموویان پێکەوە بەزمانێك دەدوان تۆ تێ نەدەگەشتیت وابزانە ئەوانە هاوڕێی دێرینەی تۆن. هەموو شتێك نایابە بەو جیاوازییەی ئەوان نازانن بەو زمانەی تۆ دەیزانیت بدوێن. وێڕای ئەوەی تەنانەت تۆ یەك وشەی زمانەکەی ئەوان نازانیت، جەستەی تۆ بەشێوەیەکی پەسەندکراو لەگەڵ ئەوان ڕووبەڕو دەبێتەوە.

من خودی خۆم کاتێ دەچمە ئەورووپا لەڕەوشی سڵاو دۆستی دێرینە کەڵك دەبینم، جاری وادەیە ئاشنایانی هاوزمانی من بەتەواوی هاوڕێکانی خۆیان دەڵێن بەبڕوای ئەوان من ڕەفتارێکی گەلێك دۆستانەم هەیە. ئەمەش هاوکاتە لەگەڵ ئەوەی من یەك وشەم نەدرکاندووە.

**پێشگوییەك پەیوەست بێت بەڕاستییەوە**

سوودێکی دیکەی "سڵاو هاوڕێی دێرینەم" ئەمەیە ئەمە جۆرێکی پێشبینییە کەپەیوەستە بەڕاستییەوە. کاتێ جۆرێك ڕەفتار دەکەیت وەك بڵێی کەسێکت خۆشدەوێ بەڕاستی هەستی ئەوە دەکەیت ئەووت خۆشدەوێت. ئەمەش ئەو پرسەیە کەدروستیەکەی لەتوێژینەوەی کار پێکرلودا سەلمێنراوە. دلولیان لەبەشداربوانی ئەم توێژینەوەیە کراوە بەجۆرێك لەگەڵ کەسانی ناملۆ و نەناسراودا ڕووبەڕو ببنەوە وەك ئەوەی بەڕاستی خۆشیان دەوێن، لەتوێژینەوەی دواتردا دەرکەوت ئەم کەسانە بەڕاستی ئەو کەسە نەناسراوانەیان خۆشویستووە، پاشان پرسیاریان لەنەناسراوەکان کردووە. دەرکەوتووە

ئەوانیش هەم بۆ بەشداربووانی توێژینەوەكە ڕێزێكی زۆریان نواندووە. ڕاستیش ئەمەیە عەشق وەبەرهێنەری عەشق دەبێت.

خۆشەویستی بەرهەمی خۆشەویستیە، ڕێز وەبەرهێنەری ڕێز دەبێت، لەڕەوشی "سڵاو هاوڕێی دێرینەم" كەڵك ببینن، تاكو لەماوەیەكی كەمدا هاوڕێیەكی فرەی دێرینەتان هەبێت.

تائێرە زانیاری سەرەتایی دەربارەی چۆنێتی هەڵسوكەوتی گونجاو لەگەڵ ئەو كەسانەی ڕووبەڕوویان دەبیتەوە بەدەست هێنا. بەڵام كار هێشتا تەواو نەبووە، وێڕای خۆشویستن، دەبێت نیشانی بدەیت شایانی متمانەیت. سێ تەكنیكتان لەدرێژەی باسەكەدا پێ دەناسێنم كەشایانی سەرنجی ئەم باسەیە.

٧

## چۆن لەدیدگای كەسانیترەوە
## سەد لەسەد شایانی پەسەند كردن بیت

هاوڕێكەم هیلین، كارگێڕێكی كارایە، ئەو كەسانی نایاب نەبێت دایان نامەزرێنێت. جارێك پرسیارم لەڕازی سەركەوتنی كرد. هیلین وتی: "ڕەنگە هۆكاری سەركەوتنی من ئەمە بێت تاڕادەیەك هەمیشە دەرك بەوە دەكەم چ كاتێ ئەوەی داوای دامەزراندن دەكات درۆ دەكات."
ئەو وتی: "هەر لەم هەفتەیەدا لەگەڵ ژنێكی گەنج دیمانیەكم كرد. دەیویست بۆ كۆمپانیایەكی بچوك بەڕێوەبەرێكی بازارسازیی بدۆزمەوە، لەتەواوی ماوەی دیمانەكەدا ئەو لەحاڵەتی ئەوەی قاچی چەپی لەسەر قاچی ڕاستی دانابوو قسەی لەگەڵ دەكردم. دەستەكانی بەشێوەیەكی ئارام لەسەر دامێنی دانابوو ڕاستەوخۆ سەیری دەكردم.
"پرسیارم دەبارەی دەسپەنجەكەی لێكرد. بێئەوەی چاوی لەسەر من بگوێزێتەوە ئەو ڕێژەیەی وەریدەگرت پێی وتم. لێم پرسی ئایا چێژ لەكارەكەی دەبینێت. ئەو لەحاڵێكدا چاوی تێ بڕیبووم، وەڵامیدایەوە. بەڵێ. پاشان لێم پرسی بۆچی وازی لەكارەكەی هێناوە.
"لەم كاتەدا چاوی لەسەر من گواستەوە ماوەیەكی خایاند تاكو چاوی تێ بریمەوە." هیلین، بەردەوام بوو: "لەم كاتە ئەو جێ گۆڕكێیەكی كرد ئەمجارە قاچی ڕاستی خستە سەر قاچی چەپی دەستی گرت بەدەمی خۆیەوە."

هیلین دەڵێت: "ئەوەی پێویستم بوو بەدەستم هێنا. ئەو وتی لەکارەکەیدا توانای گەشەکردنی نەبوو بەڵام زمانی جەستەی دەیوت کەتەواو درۆ دەکات."

هیلین، دەڵێت: "دیارە ئەم حاڵەتی جەستەیەی ئەو تەواو نەیدەسەلماند کەدرۆ دەکات. بەڵام من بڕیارمدا لەمبارەیەوە توێکاری زیاتر بکەم، باسەکەم گۆڕی‌و چوومە سەر بابەتی ئاڵۆزتر، دەربارەی ئامانجەکانی ئای تی ئای پرسیارم لێکرد، ئەو گەڕایەوە بۆحاڵەتی جەستەیی پێشوی وتی هەمیشە حەزی کردووە لەکۆمپانیایەکی بچوکدا کار بکات تاکو بتوانێ لەسەر چەندین پرۆژەی جیاواز ئەزمون بەدەست بێنێت.

"پاشان پرسیاری پێشووم دوبارە کردەوە پرسیم ئایا لەبەر ئەوە نەبوو دەرفەتی گەشەکردنی لەکاری کۆمپانیای پێشوودا نەبوو بۆیە دەستی لەکار کێشاوەتەوە. جارێکیتریش حاڵەتی دانیشتنەکەی گۆڕی‌و هاوکات کەدەربارەی کارەکەی پێشوی قسەی دەکرد، دەستی بەخوراندنی قوڵی کرد."

هیلین درێژە بەتوێژینەوەکەی دەدات تاکو پەی بەڕاستی مەسەلەکە دەبات. ئەویان لەبەر ئەوە لەکار دەرکردبوو کەخراپ لەگەڵ بەڕێوەبەری بازاڕسازیی کۆمپانیادا قسەی کردبوو.

پسپۆڕانی سەرچاوە مرۆییەکان‌و ئەو پۆلیسانەی کەلێکۆڵینەوە لەگەڵ تۆمەتبارە بەهێزەکاندا دەکەن خولی فێرکاری پێویستیان بینیوە تاکو پەی بەدرۆ گریمانەییەکان ببەن. ئەوان بەوردی دەزانن دەبێت سەرنجی چ نیشانەیەک بدەن. ئێمەش کەهێندەی نوکە دەرزییەك زانیاریمان نییە دەتوانین لەهەستی شەشەمی خۆمان بۆ پەیبردن بەحەقیقەت بەکاری بێنین.

دواجار یەکێ لەهاوکارانم دەیویست کەسێك دابمەزرێنێت، ئەو لەم پەیوەندییەدا پێی وتم: "لەوباوەڕەدانیم ئەو قسانەی لەبارەی سەرکەوتنەکانیەوە دەیکات ڕاست بن."

وتم: "وادەزانیت ئەو درۆ دەکات؟"

"بەڵێ، سەد لەسەد. بەڵام سەیر لێرەدایە هۆکارەکەی نازانم. ئەو سەیری کردم و ڕاستەوخۆ وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دامەوە. بەڵام خاڵێك لەئارادا بوو زانیم درۆ دەکات."

زیاتر کاریەدەستان بەمجۆرە بیردەکەنەوە. پەی بەپرسێك دەبەن بەڵام ناتوانن پەنجە بخەنە سەر شتێك. هەربۆیە زۆرێك لەکۆمپانیا گەورەکان سوود لەئامێری دۆزەرەوەی درۆ دەبینن.

بانکەکان، فرۆشگا خۆراکییەکان لەمیانەی چاوپێکەوتنی ئەوانەی دلیاندەمەزرێنن بەڕادەیەکی زۆر بەکاری دێنن.

ڕێکخراوەی ئیف بی ئای، ئیدارەی دادگاکان و زۆربەی دامەزراوەکانی پەیوەست بەپۆلیس دەربارەی کەسانی گومان لێکراو سوود لەو ئامێری درۆ دۆزە دەبینن.

## سەرنجی ڕواڵەتی درۆکردن بدە

## تەنانەت ئەو کاتەی درۆ دەکات:

کاتێ قسە لەگەڵ کەسانیتر دەکەین و درۆش ناکەین. دەکەوینە ژێر ترسی کەسی بەرامبەرەوە. جوامێرێك دەربارەی سەرکەوتنەکانی لەبواری بازرگانیدا بۆ ژنێکی جوان دەدوا.

ژنەکەش باسی ئەوەی دەکرد سەرکەوتنەکانی دەربارەی ڕاکێشانی موشتەری گەلێك بەرچاویی بووە. ئەو گرفتانەش ڕەنگە ڕوو بدەن کەپەیوەستن بەهەلو مەرجی تایبەتەوە. بازرگانێك هەرگیز هەستی گوشار نەکات ڕەنگە لەژێر کاریگەری گەرمای زۆرێکدا دوگمەی یەخەکەی بکاتەوە.

سیاسەتمەدارێك لەکەشێکی ئازاددا بۆ خەڵکی بدوێت ڕەنگە لەژێر کاریگەری تەپو تۆزدا کەلە هەوادایە گرژو مۆن. لەم دۆخەدا بەوەیکە وتەبێژ بەدروستی دەدوێتو ڕاستیەکانیش دەڵێت، ڕەنگە ئامادەبووان لەژێر کاریگەریی ڕەفتارو زمانی ئەوان بگەنە ئەم ئەنجامەی ئەوەی بۆیان دەدوێت درۆ دەکات.

کەسانی ڕوخۆشو بەئەزمون بۆ دورەپەرێز بوون لەم ئاستەنگە دەکۆشن جوڵەیەك نەکەن کەسانیتر بخەنە هەڵەوە. بەم مەبەستە هەمیشە لەچاوی دوێنەرەکانی خۆیان دەڕوانن.

هەرگیز دەست بۆ دەمو چاوی خۆیان نابەن. ئەگەر لوتیان بخورێت ئەوا بەدەست نایخورێنن. کاتێ هەوا گەرمە یەخەی کراسەکانیان ناکەنەوە، کاتێ هەوا تەپو تۆزاوی بێت گرژو مۆن نابن. لەبەرامبەر هەتاو چاویان نانوقێنن. ئەوان باش دەزانن ئەگەر دیقەت نەدەن شکۆمەندیو ئابڕوویان بریندار دەبێت.

ئەگەر لەگەڵ کەسێك دەدوێیت، بۆ بەدەست هێنانی بڕواو متمانەی ئەو هەوڵ بدە جوڵەی ناقۆلا لەڕەفتارتدا نەبێت. من ئەم تەکنیکەم ناو ناوە "سنوردارکردنی نائارامی".

**تەکنیکی ژمارە ٧**

**سنورداركردنی نائارامی**

**هەر كاتێ گفتوگۆیەكی گرنگت هەبێت، بوار بدە بالوتتان بێتە خوروو. گوێتان گرەگز بكات. قاچتان پەلە پەلە ببێت لەتاو خوراندن، وریابن دەست بۆ دەموچاوی خۆتان مەبەن دەست جولاندنی نزیك بەدەمو چاو هەموو ئەو رەفتارانەی هەوالی خۆنەگری و بێ ئارامی دەدەن. دەتوانن لەگوێگرەكەی تۆی بگەیێنن كەتۆ كەسێكی درۆزنیت.**

ئێستا دەچینە سەر باسی هۆش و زیرەكی رەنگە بپرسیت: " ئایا كەسەكان دەتوانن زیرەكتربن لەوەی كەهەن خۆیان نیشان بدەن؟"

ئایا رووداوی هانسی ئەسپ ژمێرت بیستووە؟ مەشورە كەهانس هۆشمەندترین ئەسپی رۆژگار بوو ئەو سوودی لەوتەكنیكە دەبینی دواتر بۆتان روندەكەمەوە.

٨

# چۆن کەسانیتر بخوێنینەوە

هانس، ئەسپی زیرەك، ئەم تەکنیکە بەجوانی ڕوون دەکاتەوە. هانس پەیوەست بوو بەفون ئوستن یەکێك بوو لەخەڵکی بەرلین، ئەو هانسی فێرکردبوو تاکو ژمارەی سادەی بیرکاری بەسمی ڕاستی ئەنجام بدات. کاری هانس هێندە نایاب بوو ناو وێنەی لەساڵەکانی ١٩٠٠ لەهەموو ئەورووپادا دەنگیدایەوە. فون ئەستون شتێکی دەربارەی کۆکردنەوە فێری ئەسپ کرد. زۆری نەخایاند ئەسپ دەیتوانی لێدەرکردن و دابەشکردن بکات. کەمێ دواتر ئەسپی زیرەك کرداری لێکدانی دەکرد، ئەسپی زیرەك گۆڕا بۆ دیاردەیەك، بێتەوەی خاوەنەکەی یەك وشە بدرکێنێت، هانس دەیتوانی ژمارەی ئەو کەسانەی هاتوون بۆ دیتنی یان ئەو کەسانەی چاویلکەیان لەچاودایە بیزانێت.
سەرەنجام هانس ڕوی جیاکردنەوەی نێوان مرۆڤەکان و ئاژەڵان واتا فێری زمان بوو. هانس فێری ئەلف با بوو ئەو بەکوتانی سمی بەزەویدا دەیتوانی وەڵامی پرسیارە جۆراو جۆرەکان بداتەوە.
ڕۆژنامەکان مانشێتەکانیان بۆ هانس تەرخان دەکردو خەڵکی لەمیوانیەکانیاندا دەربارەی ئەو قسەیان دەکرد. "ئەسپی مرۆیی" بەخێرایی سەرنجی

دانیشمەندان‌و دەروونناسان‌و پزیشکانی ڤێتێرنەری‌و ئەنانەت ئەفسەرانی سوارەی بەلای خۆیدا کێشکرد. سروشتی ئەم کەسانە تووشی گومان‌و دودڵیی بێن بۆیە کۆمیسیۆنێکیان پێك هێنا بۆ بەڕێوەبردنی هانس. دەرکەوت هانس ئەسپێکی زۆر زیرەکە بەبەراود لەگەڵ زۆرێك لەئەسپەکان هانس بۆخۆی کەسێك بوو. باکورتی بکەینەوەو بێینەوە سەر ئەمڕۆ کاتێ قسە لەگەڵ هەندێك کەسان دەکەیت تێدەگەیت ئەوان لەکەسانیتر زیرەکترن؟ ڕونتر ئەوان بۆ خۆیان کەسێکن. ئەم کەسانە قسەی سەیرو سەمەرەو زانستی ناکەن. بەمەش هەموو تێدەگەن ئەوان زیرەکن. کاتێ کەسانیتر ڕوبەڕویان دەبنەوە، لەوەسف کردنیاندا دەڵێن: "گەلێك زیرەکە." "ئاگای لەهەموو شتێکە."

سەرەنجام ڕۆژی تاقیکردنەوەی گەورە هاتە پێشەوە. هەموو وایاندەزانی لەلایەن "فون ئیستۆن"ەوە فرو فێڵێك لەکاردایە. دانیشمەندان. وتەبێژان. فیزیکدانەکان‌و هەوادارانی ئەسپ هەموو وەستابوون تاکو وەڵامی پرسیارەکانیان بدرێتەوە. کاتێ هەموو کۆ بوونەوە داوایان لەفون ئیستۆن کرد شوێنی تاقیکردنەوەکە بەجێ بێڵێت، هانس لەگەڵ ئەو کەسانەی مابونەوە بۆ تاقیکردنەوەی بەتەنیا بەجێما. سەرپەرشتیاری گورپ یەکەم پرسیاری بیرکاری خۆی کردو ئەسپ وەڵامی دروستی دایەوە. دووەم پرسیاریان لێکرد، دوبارە وەڵامی دروستی دایەوە. پرسیاری سێیەمی بەهەمانشێوە تێپەڕاند. دوای ئەوە نۆبەی پرسیاری دەربارەی زمان لێکرا. هانس بەسەرکەوتویی ئەم بەشەی تێپەڕاند. کۆمیسیۆن بەسەرسامیەوە لێیان دەڕوانی، ڕەخنەگران بێدەنگ بوون.

بەڵام کۆمەڵەکە بەمە قایل نەبوون، ئەوان داوایانکرد کۆمیسیۆنێکی دیکە پێك بێت‌و لەم بابەتە بکۆڵنەوە. ئەمەش ئەنجامدراو جارێکی دیکە لەدەوری هانس

دانیشمەندان، ئوستادەکانی زانکۆ، پزیشکانی ڤێتێرنەری، ئەفسەرانی سوارەی سوپاو گوزارشگەران‌و هەموو دنیا کۆ بوونەوە.

تەنها دوای ڕاستاندنی کۆمیسیۆنی دووەم بوو کەڕاستی بۆ هەموو لایەک ڕوون بویەوە. لەکاتی کردنی پرسیاری بیرکاری ئەمجارە لەجیاتی ئەوەی تاقیکار پرسیارەکەی خۆی بەدەنگی بەرز بکات، بەنگی نزم‌و دەیچپاند بەگوێی ئەسپەکەدا. تاقیکاری دووەم ژمارەی دووەمی بەگوێی ئەسپدا چپاند. بەڵام هانس دەرەقەتی ئەم کارە نەهات. ئایا دەتوانیت بزانیت مەسەلەکە چی لێهات؟ تێبینی لێرەدا بوو کاتێ توێژەران وەڵامی پرسیاری خۆیان دەزانی، هانسیش وەڵامی دەزانی. ئێستا دەتوانیت بەتەواوی بزانیت؟

کاتێ ئەسپ سمی لەزەوی دەکوتاو دەستی لە ژمارەکە دەدا ئامادەبوان بەجەستەی خۆیان‌و بەهەڵکێشانی هەناسەیەکی ئاسودە زانیاریان بەئەسپەکە دەدا وەڵامەکەی لەکوێدا دروستە، فۆن ئیستین بەجۆرێك ئەسپەکەی ڕاهێنابوو لەم ساتەدا سمی نەکوتێت بەزەویدا، بەمجۆرەش ئەو وەڵامەکەی دروست دەردەچوو. هانس سوودی لەتەکنیکێك دەبینی کەمن ناووم ناوە "هەستی ئەسپی هانس" هانس لەسەر کاردانەوەی ئەوانەی لەدەوری بوون وەڵامی تەواوی دەدایەوە.

## ئەگەر ئەسپێك بتوانێت ئەم کارە بکات بێگومان ئێوەش دەتوانن:

ئایا تائێستا لەحاڵەتی سەیرکردنی تەلەفیزیۆندا بویت‌و زەنگی تەلەفۆن لێبدات؟

لەم کاتەدا زۆرجار کەسێك داوات لێدەکات دەنگی تەلەفزیۆنەکە کەم بکەیتەوە تاکو ئەو بتوانێ بەتەلەفۆن قسە بکات، لێرەدا کەدەنگی تەلەفزیۆن نابیسترێت بەرنامەی تەلەفزیۆنەکە بەدیقەتەوە تەماشا دەکەیت، دەتوانیت هەست بەبزەی ئەکتەرەکان بکەیتو لەلێکدانەوەکانی ئەوان وردبیتەوە، تەنانەت ساتێك لەکیس نادەیت، بەوردبونەوە لەڕەفتاری ئەکتەرەکان دەتوانیت پەی بەئەندێشەکانیان ببەیت. هەستی ئەسپی هانس کتو مت ئاماژە بەم مەسەلەیە دەکات. سەرنجدانی کەسانیتر. وردبونەوە لەڕەفتارەکانیان پاشان بەدیقەتدانو ڕەچاوکردن خواستەکانیان ئەنجام دەدەیت.

تەنانەت ئەو کاتەی قسە دەکەیت لەچاوی دوێنەرەکەت دیقەت بدە بزانە ئەو چۆن بۆ قسەکانت کاردانەوە دەنوێنێت. جوڵەی لەدەست مەدە.ئایا بزە دەکات؟ ئایا سەری بەنیشانەی ئەرێ دادەنەوێنێت؟ ئایا لەپی دەستی هەڵبڕیوە بۆ سەرەوە؟ بەم چەشنە ئەوەی گوێی لێدەبێت پێی خۆشە. ئایا گرژو مۆنە؟ ئایا سەیری شوێنێکی دیکە دەکات؟ ڕەنگە ئەوەی گوێی لێدەبێت پێی خۆش نەبێت؟ ئایا ملی خۆی دەخورێنێت؟ ئایا هەنگاوێك دەچێتەوە بۆ دواوە؟ ئایا قاچی بەرەو دەرگاکەیە؟ڕەنگە بیەوێ ڕابکات. لێرەدا پێویستت بەخولێکی فێرکاریی نییە بۆ خوێندنی زمانی جەستە. ئەزمونی ژیانی تۆ بەر لەهەرشتێك زانیاری پێویستی پێداویت. زۆرینەی خەڵکی دەزانن ئەگەر ئەوکەسەی قسەی لەگەڵ دەکات هەنگاوێك دەچێتەوە بۆ دواوە، یان سەیری شوێنێکی دیکە دەکات، پەیوەندی بەگوێگرتن لەقسەی ئەوانەوە نییە.

## تەکنیکی ژمارە ٨

### هەستی ئەسپی هانس

خۆت ڕابێنە کاتێ قسە دەکەیت دوکار ئەنجام بدەیت. ئەو کاتەی قسە دەکەیت لەکاردانەوەی گوێگرەکەت دیقەت بدە دوای ئەوە بەرنامەڕێژیی بۆ جوڵەکانت بکە.

ئەگەر ئەسپ دەرەقەتی ئەم کارە بێت، تۆی مرۆڤیش دەتوانیت ئەم کارە بکەیت. ئەمجۆرە کەسانە سوپاس و ستایشت دەکەن و دەسخۆشی لەهۆشیاریت دەکەن.

ئاێستا بەهەشت تەکنیك ئاشنا بویت کەلەتۆ کەسێکی دڵنیا، شایانی متمانەو سەرنجکێش دروست دەکات تائەو کەسانەی ئاشنای تۆ دەبن چێژت لێ ببینن. ئێستا مۆڵەت بدە دوایین تەکنیکی ئەم بەشە باس بکەین.

٩

## چۆن دەتوانیت نیشانەو ئامازەیەك لەدەست نەدەیت!

ئایا پێشبڕكێی خلیسكێنە "پاچڵە" ت لەتەلەفزیۆندا بینیوە؟ ئەسكیتبازەكە لەسەرو خیزەلانەكەوە وەستاوە. هەموو ماسولكەكانی ئەو بونەتە گوێو چاوەڕوانە بەبیستنی دەنگی دەمانچە دەست بەبزاوتنی خۆی بكات، ئەسكیتباز لەناخی خۆیدا دەبینێت بەخێرایی بەنشێوێكدا دێتە خوارەوە بەنێوان كاریتەكاندا بەپێچ كردنەوە بەچەپو ڕاستی خۆیدا تێدەپەڕێت بەخێراییەكی خێراتر لەوانیتر دەگاتە هێڵی كۆتایی، ئەم وەرزشكارە وێنەسازیی دەكات.

هەموو وەرزشكاران ئەم كارە دەكەن، مەلەوانەكان، ڕاكەرەكان، هەڵفڕەكان، ئەسكیتبازەكان، یاریزانەكانی كرۆباتیك، ئەمانە بەرلەوەی جوڵەی خۆیان دەست پێبكەن لەزەینی خۆیاندا بەرجەستەی دەكەن. ئەوان جەستەی خۆیان دەبینن كەدەچەمێتەوە، پرتاو دەدەن، یان لەهەوادا دەفڕن. دەنگی با دەبیستن، دەنگی نووقم بونیان لەئاودا دەبیستن. جوڵەی نێزەكانیان لەهەوادا دەبینن. بۆنی گیا هەست پێدەكەن، وەرزشكارانی پیشەیی بەرلەوەی ماسولكەكانیان بجوڵێنن. هەموو فیلمی جوڵەكانیان لەزەینی خۆیاندا وێنا دەكەن. خۆیان دەبینن سەركەوتنیان بەدەست هێناوە.

دەروونناسانی وەرزشی لەباوەڕەدان كەوێنەسازیی تەنها لەم پاڵەوانانەدا بەرجەستە نییە. دەركەوتووە كەسانێك لەوێنەسازیی زەینی سوود دەبینن ئاكامی باشتریان بەدەست هێناوە.

## "بیست و  شەش میل لەسەر ڕایەخ، دۆشەك"

هاوڕێكەم ریچارد ڕاكەری ماراسۆنە، چەن ساڵێك بەر لەئێستا سێ هەفتەر مابوو بۆ پێشبڕكێ مەزنەكەی ماراسۆنی نیویۆرك لەگەل ئۆتۆمبێلێكدا تووشر پێكدادان بوو. ریچارد زەبرێكی زۆری پێكەشتو ڕەوانەی نەخۆشخانەیان كرد برینێكی هێندە سەختی نەبوو. هاوڕێكانی بۆی بەداخ بوون دوای دوو هەفت مانەوەی لەنەخۆشخانە شانسی بەشداربوونی لەو پێشبڕكێیە لەدەستچوو.

بەڵام لەمیانەی سەرسامی هاوڕێكانی ریچارد لەرۆژی دەسپێكردنی پێشبڕكێكەی سینترالْ پارك بەجلی ڕاكردنەوە دەركەوت.

هەمووومان هاوارمان كرد كە "ریچارد مەگەر شێت بویت؟ تۆ ئامادەیی بەشداربوونی پێشبڕكێی ماراسۆنت نییە."

ئەو لەوەڵامدا وتی: "جەستەم لەسەر جێگەی نوستن بوو، بەڵام من مەشقی ڕاهێنانی خۆمم دەكرد."

یەكدەنگ لێم پرسی: "چیی؟"

"بەڵێ، هەموو رۆژێك بیستو شەش میل، ٣٨٥ یاردە لەسەر جێگەی نوستنەكەم ڕامدەكرد." ریچارد لەتەواوی ئەم ماوەیەدا لەوێنەسازی زەینیدا كەبۆخۆی دروستی كردبوو لەحاڵەتی ڕاكردندا بوو. ئەو دیمەنەكانی دەبینی دەنگەكانی دەبیستو هەستی دەكرد ماسولكەكانی لەحاڵەتی چالاكیدان. ئەو خودی خۆی دەبینی لەپێشبڕكێی ماراسۆندا بەشداری دەكات.

ریچارد نەیتوانی لەئاستی پێشبڕكێی ساڵی پێشوودا بێت بەڵام توانی پێشبڕكێكە تەواو بكات. وێنەسازیی لەهەركارێكدا بتەوێ ئەنجامی بدەیت دەتوانێ ڕۆڵێكی هەستیار ببینێت. تەنانەت بۆ ئەوەی پەیوەندییەكی بنەڕ بیەستیت دەتوانیت لەوێنەسازیی زەینی سوود ببینیت.

وینەسازی كاتێك كاریگەر دەبێت لەحاڵەتی ئارامی تەواودا بێت. تەنها كاتێ زەینێكی ئارامت هەیە دەتوانی وێنەی زیندو رۆشن لەزەینی خۆتدا بەدی بێنیت. وێنەسازیی لەتەنیایی ماڵەوە یان لەناو ئۆتۆمبێلی خۆت بەرلەوەی بچیت بۆ میوانداریی، كۆڕی گرنگ، یان سیمینارێك ئەنجامی بدە. بەر لەهەر شتێك هەر دیمەنێكت دەوێت لەزەینی خۆتدا وێنای بكە.

تۆ ئێستا خاوەنی كارامەییەكیت تاكو بەئاسانی ڕووبەڕووی كەسانی نوێ ببیتەوەو ئاڵوگۆڕیان لەتەك بكەیت، هەست بكە راكێشەكیت لەڕوی بەرز دەبیتەوە، كاتێ لەشوێنی دەستپێكی سەفەر بۆ گۆی مانگ یەك هەڵەی یەك پلەیی شێوەیەكی دیەكی بەخۆیەوە دەگرێت كەشتیەكە یەك ملیۆن پلە لەگۆی مانگ لادەدات. بەهەمانشێوە كەمی هەڵە لەرمانی هەستە پەیوەندی تۆ بەكەسانیترەوە تێك دەدات. بۆكۆمەكی ئەو رێكارانەی ئاتیرە بۆم ڕونكردنەوە. دەتوانیت لەئاڵوگۆڕەكاندا لەگەڵ كەسانیتر سەركەوتن مسۆگەر بكەیت.

☆ تەكنیكی ژمارە ٩

**پێشتر سەرنجی سەكۆی نمایش بدە**

ئەو كەسێتییەی دەتەوێ نمایشی بكەیت پێشتر مەشقی بۆ بكە خۆت ببینە بەدڵنیاییەوە بەرێدا دەڕۆیت. بەدڵنیاییەوە دەدوێیت. چاوی دیواودەرت هەیە. خۆت ببیستە كەلەگەڵ هەمووان دەدوێیت. خۆتت لەبەرچاو بێت دوای ئەمە هەموو شتێك بەخێرو خۆشی تێدەپەڕێت

## بەشی دووەم

### دوای سڵاو کردن چی دەکەیت؟

دروست هەروەك لەیەکەم نیگاوە دەبێت کەسی بەرامبەر قایل بکەیت، یەکەمین ووشەکانت دەبێت لەگوێ هەڵچەقێت. زمانی تۆ ئامرازێکە کەسانێتر نزیك یان دور دەخاتەوە. بۆ ئەوەی کەسی بەرامبەر هەستێکی باشی هەبێت دەبێت بەسەر ئاخاوتندا زاڵ بیت.

من چەندیجار ڕوبەڕوی بەڕێوەبەرانی باڵادەست بومەتەوە کەلەگەڵ دەستەی ئەندامانی بەڕێوەبردندا لەگەڵ هاوپشکانو موشتەریانی گەورە بەئاسانی قسە دەکەن، بەڵام کاتێ لەمیوانییەکدا دوو وشەی خۆمانە بڵێن. تووشی کێشە دەبن.

دەبێت بزانرێت ترس لەقسەکردنی خۆمانە ترس لەنمایش یەك وونەن. دڵەڕاوکێیەك لەکاتی قسەکردندا توشت دەبێت. هەمان ئەو دڵەڕاوکێیە هونەرمەندانو نمایشکارانی مەزن لەسەر سەکۆی نمایش توشیان دەبێت.

### ئایا قسەی خۆمانە "فۆبیا"ی شایانی چارەسەرە؟

جاری واهەیە دانیشمەندان دەڵێن ترس لەقسەی خۆمانەو تێکەڵاوی بەهۆی دەرمانەوە چارەسەر دەکرێت. پزیشکان دەیانەوێ بەکۆمەکی دەرمانی پڕۆزاك کەسێتی کەسەکان بگۆڕن. بەڵام هەندێکیان لەکاریتەی لاوەکی فەلاکەنباری

ئەم دەرمانە دەترسێن. هەواڵی خۆش ئەمەیە کاتێ مرۆڤەکان بیر دەکەنەوەو هەست دەکەن مێشك مەرهەمی خۆی وەبەردێنێت ئەگەر ترس‌و بەلای قسەی خۆمانە نەخۆشی بێت. زانیاری لەسەر تەکنیکی گونجاو کەلەم بەشەی ئەم کتێبەدا ئاماژەم پێکردووە ڕێچار ئەمەیە.

وردە وردە زانست دەگاتە ئەم ئاکامە کەڕێکەوت یان جۆری پەروەردەی سەردەمی منداڵی نییە کەدەبێتە ئەو هۆیەی کەسێك لەکاتی ئاخاوتن توشی دڵەڕاوکێ دەبێت‌و کەسێك هەرگیز ناڕەحەت نابێت. لەمێشکدا نۆرونەکان لەڕێی ماددەی کیمیاییەوە بەناوی گوێزەرەوەی کیمیاییەکان پێکەوە پەیوەندی دەکەن هەندێکیان لەئاستێکی بەرز لەگواستنەوەی دەمارێك بەناوی نۆرپین فرینەو یەك ماددەی کیمیایی وەك ئەدرنالینە. هەندێ لەمناڵان کاتێ دەچنە دایەنگای مناڵانەوە، دەیانەوێ خێرا خۆیان لەژێر مێزێکدا بشارنەوە. من بەمناڵی لەژێر مێزدا خۆمم دەشاردەوە. دواتر کاتێ دەمویست لەگەڵ کەسێك قسە بکەم تووشی دڵەڕاوکێ دەبووم‌و قاچەکانم دەلەرزین.

مەبەستمان لەم بەشەی ئەم کتێبە ئەمە نییە هانتان بدەین بۆ قسەی خۆمانەو لێرەدا بۆستین. مەبەست ئەمەیە لەنێوە کەسێك خۆش مەشرەب‌و قسەخۆشتان لێ دروست بکەین. بەلام بەدەست هێنانی ئەزمون لەقسەی خۆمانەدا یەکەمین هەنگاوێکە بۆ گەیشتن بەئامانجی کەسی قسەخۆش.

## ١٠

# چۆن تێکەڵاوییەکی نایابمان هەبێت

لەمیوانی یان لەچاوپێکەوتنێکدا خۆت بەکەسێك دەناسێنیت. تەوقەی لەگەڵ دەکەیت. چاوتان بەیەکتریی دەکەوێت لەناکاو هەستی ئەوە دەکەین قسەیەکت بۆ وتن نییە. بێدەنگی باڵ دەکێشێت. ئەو کەسەی خۆی پێ ناساندویت ڕێی خۆی دەگرێتو دەچێتە سەر باسی خواردن. دەمانەوێ یەکەمین وشەیەك لەلێومان دێتە دەرەوە نایابو وەرگیراو بێت. دەمانەوێ ئەو کەسانەی گوێمان بۆ دەگرن بڵێن چەن نایابانە دەدوێین. جارێك بەشداری کۆڕێکم کردبوو هەموو قسەی نایابو سەرنج کێشیان دەکرد هەموو دەیانویست لە دە وشەی یەکەم بەهێزی خۆیان بسەلمێنن. چەن ساڵێك بەر لەئێستا ڕێکخراوی منسا، گروپێکی کۆمەڵایەتی کەسانی ڕۆشنبیرو زیرەکی هەبوو، داوای لێکردم تاکو لەفیستیڤاڵی ساڵانەی ئەواندا وتاربێژیی بکەم. سواری ئاسانسوار بووم پڕ بوون لەو کەسانەی دەیانویست لەو کۆڕەدا ئامادەبن ئەوکاتەی لەئاسانسوارەکەدا بەرەو نهۆمەکانی سەرەوە دەچووین ئاسانسوارەکە چەن تەکانێکیدا.

وتم: "ڕەنگە ئاسانسوارەکە کێشەیەکی هەبێت." لەم کاتەدا هەموو ئامادەبوان لەئاسانسوارەکەدا قسەیان دەکردو ڕای خۆیان دەردەبڕی، من تیامابووم دەبێت لەگەڵ ئەم کەسە زیرەکانەدا چی بکەم.

دواتر کەلە ژوورەکەمدا بەتەنها دانیشتم. هات بەخەیاڵمدا ئەم ئەندامە پێکهێنەرانەی منسا چەن کەسانێکی نایابن. چونکە کاردانەوەی خێرایان

نواندبوو! ماندو بووم. هەر وەك دەبينيت، تێکەڵاو بوون دەربارەی ڕاستیەکان یان وشەکان نییە. پرسەکە پرسی مۆسیقاو ئاهەنگو نەوایە. تێکەڵ بوون دەربارەی بەخشینی هەستی ئارامی بەکەسانیترە. دەبێت بتوانیت لەگەڵ دڵو دەرونی بیسەرەکانتدا هاوخوان بیت.

کەسانێك خاوەنی کارامەیی پەیوەندییەکانن، ڕیتمو دەنگی بیسەرەکانی خۆیان دەگرنو لەئاستی ئەواندا دەدوێن.

ئایا هەرگیز ئەوەت بەسەر هاتووە مەبەستی پشودانت هەیە، کەسێك بەتین هەژانەوەو یەك لەسەر یەك پرسیارت لێدەکات؟ ئایا هەرگیز ڕێکەوتووە لەکاتێکدا پەلەتەو دەبێت لەزوترین کاتدا بگەیتە شوێنێك. کەسێکی ئاشنات تووش دەبێتو بەسەرهاتێکی درێژو نەبڕاوەت بۆ دەگێڕێتەوە؟ قسەکانی هەرئەندازەیەك مایەی سەرنج بێت، لەم ساتەدا حەز بەبیستنی نەکەیت.

یەکەم هەنگاو بۆ دەسپێکی گفتوگۆیەکی باش ئەمەیە خۆت لەگەڵ دڵو دەرونی گوێگردا هاوخوان بکەیت. کاتێ نۆبەی تێکەڵاویی و قسەی خۆمانە دێت، لەجیاتی بیرکردنەوە لەوشەکان بیر لەمۆسیقا بکەرەوە. لەگەڵ بەپەلە قسەکردنی لایەنی بەرامبەردا هاوخوانبە، لەگەڵ دڵو دەرونیدا هاونەوابە.

**هاونەوا بوون لەگەڵ دڵو دەرون:**

هاونەوا بوون لەگەڵ دڵو دەرونی موشتەرییان بۆ فرۆشیاران گرنگییەکی پیشەیی هەیە. چەن ساڵێك لەمەوبەر دەمویست بۆ هاوڕێیەکم، ئیستلا، میوانییەك ساز بکەم، هەم ساڵوگەڕیی لەدایك بوونی ئەو بوو هەم تازە هاوسەرگیریی کردبوو هەم لەگەڵ کارو پیشەی دڵخوازی خۆی دەسبەکار بوو. لەسەردەمی قۆناغی سەرەتاییماندا پێکەوە بووین.

بیستبووم یەکێ لەچێشتخانە تایبەتەکانی شار، هۆڵێکی گونجاوی بۆ میوانداریی هەیە. کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ ڕۆژێك چووم بۆ ئەو چێشتخانەیەو داوام کرد ئەو هۆڵە تایبەتەم نیشان بدەن. بەرپرسی چێشتخانەکە بەچەن وشەیەکی تێکشکاو پێی وتم ئەو ژورە لەودیو چێشتخانەکەیەو گەر بمەوێ دەبێت خۆم بڕۆم بیبینم. ڕیتمی ئاخاوتنی بەجۆرێك بوو تێکیدامو گەشتمە ئەوەی لەم چێشتخانەیە میوانییەکەم ساز نەکەم. بێئەوەی تەنانەت ئەو هۆڵ ببینم. بەرپرسی چێشتخانە ئەم موشتەرییەی لەدەستدابوو، هاتمە دەرەوە هەتا شوێنێك بدۆزمەوە بەڕێوەبەرەکەی هیچ نەبێ بیەوێ لەگەڵ هەژینی موشتەرییەکەیدا هاوبەش بێت.

هەر دایکێك ئەم پرسە بەچاکیی دەزانێ. ئەگەر منالە بچوکەکەی بۆلە بۆڵ بکات دایك پەنجەی بۆ ڕاناکێشێتو نالێت "بێدەنگ". نا، لەجیاتی ئەمە منالەکەی دەباتە شوێنی خۆیو لەگەڵیدا بەڕەوشێکی هێمن دڵنەوایی دەکات تاکو ئارام دەبێتەوە. وریابە، گوێگرەکانی تۆ هەموویان منالی گەورەن. ئەگەر دەتەوێ نەگریێن ئەوا لەگەڵ دڵو دەرونی ئەوان هاوخوانو تەبابە.

### ☆ تەکنیکی ژمارە ١٠

**لەگەڵ دڵو دەرونی ئەواندا تەباو هاوخوانبە**

بەرلەوەی قسەیەك بکەیت، بەبیستنی یەك دوو وشەی لایەنی بەرامبەر حاڵەتی ناخو دەرونی ئەو بدۆزەرەوە. بزانە گوێگرەکەت لە چ دۆخێکی دەرونیدایە. ئەگەر دەتەوێ کەسانێتر لەدەوری خۆت کۆ بکەیتەوە، لەگەڵ دڵو دەرونو ڕیتمی دەنگی ئەواندا تەباو هاوخوانبە.

## ١١ ☆

## چۆن دەتوانیت (پێشەوەی بزانیت چی دەڵێیت!)
## کەسێتیەکی بەرجەستەی خۆت بنوێنیت

جارێك لەمیوانیەکدا بینیم کەسێك کۆمەڵی میوانەکانی لەدەوری خۆی کۆ کردۆتەوە. ئەو بزە لەسەر لێوانی بوو سەرنجی میوانەکانی بۆ خۆی کێش کردبوو. منیش چوومە لایانەوە یەك دوو خولەکێك گوێم بۆ قسەکانی گرت، پاش کەمێ هات بەخەیاڵمدا قسەی پڕوپوچ دەکات. بەلام هێندە بەجۆش و هەژێنەوە دەدوا سەرنجی هەموو لایەکی بۆ خۆی ڕاکێشابوو. گەشتمە ئەم ئاکامەی هەمیشە مەسەلە ئەمە نییە تۆ چی دەڵێیت، گرنگتر ئەمەیە چۆن دەیڵێیت.

کاتێ ڕووبەڕوی کەسانیتر دەبمەوە.

**چۆن بتوانم دەسپێکەری بابەتێك من بم؟**

زیاتر ئەم پرسیارەم لێدەکەن و منیش وەلامێکیان دەدەمەوە کەژنێك پێشتر لەنوسینگەکەی مندا کاری دەکرد هەمیشە ئامازەی بەمە دەکرد. جاری وا هەبوو بۆ خواردنی لەفەیەك دەچووم، لێم دەپرسی: "دوتی، حەز لەچ خواردنێك دەکەیت بۆت بکڕم؟"

دوتی دەیوت: "هەرچی بکڕیت بەلای منەوە خۆشە."

دەمویست هاوار بکەم: "نا دوتی، بڵێ حەز لەچی دەکەیت؟"

ڕەنگە کەمێ بیزارکەر بێت، بەڵام دەتوانی وەك دەسپێکردن هەرچیت پێخۆش بێت بیڵێیت.

چۆن دەتوانیت هەستی ئارامی بەکەسانیتر بدەیت؟ بەقایلکردنیان کە هەڵەیی لەکاریانـدا نییـەو هـەردوکتان هاوشـێوەی یـەکترین.بـەمجۆرە دیـواری هـەرس بوون. گومانی خراپ، بێ متمانەیی لەناو دەبەیت.

## بۆچی قسەی پەراوێز خراپ پەیوەندی گرێ دەدات؟

سـامۆئیل هایاکـاوا، ڕاگـری کۆلێـژێك، یـەك سـیناتۆرو یـەك توێـژەری مـەزنی بەڕەگەز ژاپۆنی. لەوتەی ئەو ڕامێنە.

لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٣ دوای هێرشەکەی پیرل هاربرو ئەو دەمەی هـەبوونی سـیخوڕە ژاپۆنیـەکان لەئـەمریکادا بـەربڵاو بـوو. هایاکـاوا ناچـار بـوو چـەنین کاتژمێر لەوێستگەی شەمەنەفەری ئەشکوش لەویس کانسین چاوەڕوانی بکات. ئـەو سـەرنجیدا زۆربـەی ئـەو کەسـانەی لەوێسـتگەکەدا چـاوەڕوانی گەشتی شـەمەنەفەریان دەکـرد بـەگومانی خراپـەوە لێـی دەڕوانـن، بۆهـۆی ئـاڵۆزیی و جەنگـەوە دەربـارەی هـەبوونی ئـەو لـەو شـوێنەدا بـەدبین بـوون. ئـەو دواتـر لەشـوێنێکدا دەنوسـێت: "ژنو مێردێـك کـەمناڵێکیان پـێ بـوو بەگومانـەوە سەیریان دەکردمو بەگوێی یەکتریدا دەیانچرپاند."

بەڵام هایاکاوا چی کرد؟ ئەو هەوڵیدا بەقسـەیەك خـەیاڵیان ئاسودە بکات. ئەو بەمێردەکـەی وت گـەلێك ناخۆشـە لەشـەوێکی سـاردی ئـاوادا لەوێستگەیەکی شەمەنەفەردا چاوەڕوانی بکەیت. پیاوەکە ئەم قسەیەی پەسەند کرد.

هایاکاوا لەدرێژەی بابەتەکەیدا دەنوسێت: "بـەووم وت بەتایبـەتی زۆر سەختە لەزستانداو بەمناڵێکەوەو وێـڕای ئەمـەش بەرنامـەی شـەمەنەفەرەکانیش هێندە

ڕێك و پێك نین، لەوێستگەیەکدا چاوەڕوانی بکەیت. جارێکی دیکە مێردەکەی قسەکەی منی پەسەند کردەوە. پاشان دەربارەی تەمەنی منداڵەکەیان پرسیم و پێم وتن منداڵەکەیان بەپێی تەمەنەکەی هێشتا بچوکە. جارێکیتر ئەو قسەکەی منی پەسەند کرد، جیاوازتر لەجارەکانیتر ئەمجارە بزەیەك کەوتە سەر لێوەکانی گوشارەکە بەشێنەیی ڕەوییەوە."

دوای دوو یان سێ ئاڵوگۆڕیتر ئەو پیاوە لە هایاکاوای پرسی: "هیوادارام لەقسەکەم دلگران نەبیت. تۆ ژاپۆنیت، وانییە؟ ئایا پێت وایە ژاپۆن شانسی بردنەوەی ئەم شەڕەی هەیە؟"

هایاکاوا وتی: "گومانەکەی تۆ دەربارەی من تەواوە. من زیاتر لەوەی لەڕۆژنامەکاندا دەیخوێنمەوە زانیاریم نییە، بەڵام لەو باوەڕەدا نیم. ژاپۆنیەکان بەبێ هەبوونی سوتەمەنی و خەڵوزی بەردو نەوت و پۆڵا چۆن دەتوانن وڵاتێکی پیشەسازی بەهێز بەچۆکدا بێنن!"

هایاکاوا درێژەی پێدەدات: "قسەی من نەبنەمایەکی هەبوو نەزانیاریشم لەسەری هەبوو، سەدان تەفسیری ڕادیۆیی لەو سەردەمەدا هەمان قسەیان دەکرد."

پیاوێکی خەڵك یویسکانسین بەخێرایی بەم قسەیە کۆك بوو پاشان وتی: "هیوادارم دایك و باوکت لەم بارو دۆخەی شەڕدا لەوێ نەژین."

هایاکاوا وتی: "چۆن، لەوێ دەژین. باوك و دایك و دووخوشکم لەوێ دەژین."

پیاوەکە پرسی: "هەواڵیکت لێیان هەیە؟"

هایاکاوا وەلامیدایەوە: "چۆن بتوانم هەواڵم لێیان هەبێت؟"

ئێستا ژن و مێردەکە کەمێ ناڕەحەت دەردەکەوون هەستی هاودەردیان هەبوو.
"ئایا مەبەستان ئەمەیە تاکو شەڕ کۆتایی پێ نەیەت و ناتوانیت ئەوان ببینین یان هەوڵێکیان بزانیت؟"

لەکۆتایی گفتوگۆ کردن، ژن و مێردەکە داوایان لەهایاکاوا کرد ئەگەر دەرفەتێ هەبوو سەرێك لەماڵی ئەوان بدات. هەموو ئەم ڕوداوانە لەبەر دەربڕینی چەن ڕستەیەکی ئاسایی پەراوێزخراو بوو. ئەو کەسەی شارەزایانە پرێکی پەیوەندی دەبەستێت چاك دەزانێ یەکەم وشەی تا چ ئەندازەیەك دەبێت ئارام بەخش بێت.

### ☆ تەکنیکی ژمارە ١١

**بەچێژەوە بدوێ**

**ئایا نیگەرانی دەربڕینی یەکەم وشەیت؟ ترس لەدڵتدا نەبێت چونکە ٨٠٪ لێکدانەوەی گوێگرەکانت کاریان بەوشەکانتەوە نییە تاڕادەیەك هەر وشەو قسەیەك دەربڕیت. هێندە بەسە بەعەشق و خۆشەویستی و چێژەوە بدوێیت.**

### "هەموو شتێك بێجگە لەکاڵباسی جگەر"

بابچینەوە بۆلای "دوتی" کەچاوەڕوانی لەفە بوو. کاتێ هاتمە دەرەوە لەبیری ئەوەدا بووم لەفەی چ خواردنێك بۆ دوتی بکڕم، پێی وتم:" هەر شتێك بێجگە لەکاڵباسی جگەر." سوپاس دوتی، هەرئەمە هاوکاریم دەکات.

تۆش دەتوانیت هەر قسەیەك بکەیت بەو مەرجەی سکاڵایەکی تێدا نەبێت، بێ ئەدەبانەو ناخۆش نەبێت. ئەگەر ئەو یەکەم وشەیەی بەکاری دەبەیت ساکالایەکی تێدا بێت، خەڵکی بەکەسێکی گلەییکەرت دەزانن. چونکە ئەم

سکاڵایە تائەو ساتە سەد لەسەد قسەکەی تۆی پێك هێناوە. ڕەنگە بەپێچەوانەوە گەلێك شادو دڵخۆش بیت. بەڵام ئەوان چۆن ئەمە بزانن؟ بۆیە هەوڵبدە وشەکانی سەرەتایی بێ ئەدەبانە نەبێت.

ئەو جۆرە قسانەی گرژو مۆنی دەردەخەن لێیان بەدوربە و هەرقسەیەکی دیکەت هەیە دەریبڕە، لێیان بپرسە خەڵکی کوێن، ناسراوێکیان لەکوێ هەیە. ئەو جلە جوانەی بەریان لەکوێ کڕیوە...

ئایا هێشتا لەبەستنی پەیوەندییەك لەگەڵ کەسانێکدا دژواریت هەیە؟ با سەرێك لەبەستنی پەیوەندییەکان بدەین. لەدرێژەی باسەکەدا سێ تەکنیکی کورت و سادەتان بۆ باس دەکەم تاکو بتوانن لەمیوانییەکاندا لەگەڵ کەسەکان بدوێن.

١٢

## چی بکەین کەسانیتر بیانەوێ لەگەڵماندا بدوێن

بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ دەتوانیت لەوشەی "ئەمە چییە؟" سوودمەند بیت. کەڕوبەڕوی زۆربەی کەسەکان دەبیتەوە زۆربەیان شتێکیان پێیە دەتوانیت بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ لەدەبڕینی "ئەمە چییە؟" سوودمەند بیتو لەگەڵ ئەواندا بچیتە نێو گفتوگۆوە.

خودی خۆم چاویلکەیەکی مۆدێل کۆنم لەملم کردووە کەلەچاویلکەی چلو ناچێت. زۆربەی ئەو کەسانەی دیانبینیم بەدیتنی دەڵێن "ئەمە چییە؟" پاشان منیش بۆیان ڕوندەکەمەوە ئەمە لەوێوە هاتووەو چ سودێکی هەیە.

ئەگەر دەتەوێ لەگەڵ کەسێك دەرگای گفتوگۆ بخەیتە سەر پشت شتێك لەودا بدۆزەرەوە بەوشەی "ئەمە چییە؟" بتوانیت پرسیاری لێبکەیت.

"ئەمە چییە؟" ڕێگەیەك بەرەو عەشق

دەتوانیت لەچەکی "ئەمە چییە؟" لەبواری کارو پیشەدا دەسپێکی عەشقێکی نوێدا بەکاری بێنیت. هاوڕێم ئەلیکساندەر هەمیشە تەسبیحێکی یۆنانی بەدەستەوەیە. دەزانێ هەرکەس بیبینێت لێی دەپرسێت: "ئەمە چییە؟" بەمجۆرە ئەو دەتوانێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکیدا پەیوەندی ببەستێت. وابزانە لەمیوانیەکدایت شتێکی بەناوی "ئەمە چییە؟"ت پێ نییە. ئەو کەسانەی دەیانەوێ دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ تۆدا بخەنە سەر پشت دەبێت چی بکەن؟

تۆش بەدوای "ئەمە چییە؟" دا بگەڕێ.

ئەگەر دەتەوێ گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت، بەدوای "ئەمە چییە؟" یەکدا لەواندا بگەڕێ. ڕەنگە ڕێکەوێت دەرزیەکی سنجاق بەچاکەتی کەسێکەوە ببینیت. دەتوانیت لێی بپرسیت: "ئەمە چییە؟" ئایا تۆ یاریزانێکی گۆلفیت؟ منیش یاری گۆڵف دەکەم. تۆ لەکوێ یاری دەکەیت؟" کارتی "ڤیزیت" سەردان و بازرگانی تۆ "ئەمە چییە؟" دراوێکی گرنگی ئاڵوگۆڕە کردنە.

☆ تەکنیکی ژمارە ١٢

**هەمیشە با "ئەمە چییە؟" ت پێ بێت.**

هەرکاتێ دەچیت بۆ میوانی یان دەچیتە کۆڕێکەوە. با "ئەمە چییە؟"ت پێ بێت. بەمجۆرە دەکرێت هەمووان بیانەوێ قسەت لەگەڵ بکەن.

ئێستا دوای باسی "ئەمە چییە؟" تەکنیکێك بەناوی "ئەو کێیە؟" باس دەکەین.

## ١٢

### چۆن ئەو کەسانە دەبیتەوە کەدەتەوێ لەگەڵیاندا بدوێیت

گریمان لەکۆڕێکدا کەسێك دەبینیت بە بۆنەی کارەکەتەوە دەتـەوێ پەیوەندیت پێوە بکەیت، هەرچەن لێی ورد دەبیتەوە نیشانەیەکی "ئەمە چییە؟" ی تێدا نابینیتەوە.

لێرەدا دەتوانی سوود لەڕەوشی "ئەمە کێیـە؟" ببینیـت. وەك سیاسـەتمەدارێك بچیتە لای ئەو کەسەی میوانداریەکەی سازکردووە بەئاماژە بۆ کەسـی مەبەست لەخاوەنماڵ بپرسیت: "ئەو کێیە؟" پاشان داوای لێبکـەیت تـۆ بـەو بناسێنێت. دودڵ مەبە. ئەو کەسەی میوانداریەکەی سازکردووە. زیاتر کەکەسێك دەبینێت دەیەوێ لەگەڵ یەکێ لەمیوانەکانیتری بناسێت خۆشحاڵ دەبێت.

بـەڵام ئەگـەر نەتـەوێ خـاوەن میوانیەکـە لەکۆڕەکـە دور بخەیتـەوە دەتوانیـت لەڕەوشـی" ئـەو کێیـە؟" سـوود ببینیـت. هێنـدە بەسـە زانیـاری لـەبواری جیاوازەوە دەربارەی کەسی مەبەست لەخاوەن ماڵ وەرگریت.

گریمان خاوەنماڵ پێت دەڵێت: "ئەو جان ئیسمیت"ە. دروست نازانم چ کارێکی هەیە بەڵام دەزانم خولیای "ئەسکیت"ە ئێستا کەسـی مەبەسـتت دۆزیوەتـەوە ناتوانیت بچیت بۆلای‌و پێی بڵێت "سڵاو، تۆ جان ئیسمیت یـت وانییـە؟ سوزان

پێی وتم تۆ ئەسکێتبازێکی زۆر نایابیت، لەکوێ یاری دەکەیت؟" ئێستا لەمەبەستی من تێگەشتیت.

☆ تەکنیکی ژمارە ١٢

ئەو کێیە؟

"ئەو کێیە؟" کەرەسەیکی نایاب بۆ ئاشنابونی کەسانیتر کەکەمتر سودی لێوەردەگرێت. داوا لەو کەسە بکە کۆڕەکەی سازکردووە تۆ بەو بناسێنێت یان زانیاری تەواو لەبارەی کەسی مەبەستەوە بەتۆ بدات. بەمجۆرە دەتوانیت ئاشنای کەسی مەبەست بیت.

ئێستا کاتی ئەوەیە ئامارە بەسێیەم ڕەوشی کاریگەری ئاشنابوون بکەین.

## ١٤

## چۆن بچینە نێو دڵی خەڵکی یەوە

ئەو کەسەی دەتەوێ لەگەڵیدا بدوێیت. "ئەمە چییە؟"ی پێ نییە؟ ئەوەی کوڕەکەی سازکردووە ئەویش نادۆزیتەوە تاکو سود لەڕەوشی "ئەو کێیە؟" ببینیت لەهەمووی خراپتر ئەو کەسەی دەتەوێ بیناسیت خەریکی قسەکردن لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی. لەوە دەچێت دۆخێکی هیوابڕت هەبێت. بەڵام تۆ یەک سیاسەتمەداریتو هیچ هۆکارێك ناتوانێ لەگەیشتن بەخواستەکەت دوات بخات. دەتوانیت لەڕەوشی "گوێگرتن" سوود ببینیت. لەمیوانیەکەدا لەنزیکی کۆمەڵێکەوە بوەستیت کەدەتەوێ تێکەڵیان بیت. پاشان بەبەکارهێنانی یەک دوو وشە بۆ چونە نێو کۆمەڵەکەیانەوە بۆ نمونە بڵێیت: "هەرکە وەستا بووم گوێم لێبوو قسەتان دەربارەی بەرمۆدا دەکرد. ڕەنگە یەك دوو هەفتەی تر بڕۆم بۆ ئەوێ ئەمە یەکەمجارمە بچمە ئەو شوێنە.

پێشنیارێکتان بۆ من پێ نییە؟" ئێستا تۆ چویتە نێو ئەو کۆمەڵەوە دەتوانیت قسەکانت بەوان بڵێیت.

### تەکنیکی ژمارە ١٤

**کوێگرتن**

**کاتێ "ئەمە چییە؟" و "ئەمە کێیە؟" کاری خۆیان لەدەست دەدەن، گرفتێك نایەتە پێش، هێندە بەسە خۆت لەکۆمەڵێك نزیك بکەیتەوە کەدەتەوێ ئاشنایان بیتو چاوەڕوان بیت. پاشان لەناکاو بچیتە نێو قسەکانی ئەوانەوە.**

**"ببورن، بێئەوەی بمەوێ گوێم لێبوو کە..."**

**بەمجۆرە دەتوانیت دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ ئەواندا بکەیتەوە.**

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بچینە سەر بەستنی پەیوەندییکی دیکە.

## ١٥

### لەبابەتی "خەڵکی کوێیت" سوود ببینە

بەشداریت لەجڤاتێکدا کردووە، هەرکەسێك دەبینیت لێت دەپرسێت: "خەڵکی کوێیت؟" ئەگە بەدوو وشە وڵام بدەیتەوە بۆ نمونە "من خەڵکی موکانوادام" چاوەڕوانیت چۆن ڕووبەڕوت ببنەوە؟ ئەو کەسەی پرسیارت لێدەکات بەخۆی دەڵێت: "دەبێت ئێستا بڵێم چی؟"

لەگەڵ خۆتو کەسانیتر چاکەیەك بکە. هەرگیز بەڕستەیەکی کورت وەڵامی ئەم پرسیارە مەدەرەوە. کاتێ کەسێك لێت دەپرسێت: "خەڵکی کوێیت؟" وەڵامێکی بدەرەوە قسەیەکی بۆ وتن هەبێت، هێندە بەسە یەك دوو ڕستە دەربارەی ئەو شارەی تێیدا دەژیت بڵێیت. چەن باشترە ئاماژە بەشوێنی ژیانی ڕاستەقینەت بکەیت یان دەربارەی ڕوداوێکی سەرسوڕ هێنەر کەلەوێ ڕویدا بێت بدوێیت.چەن مانگێك بەر لەئێستا ڕێکخراوێکی بازرگانی بانگ هێشتیان کردم تاکو دەربارەی بەستنی پەیوەندی بۆ ئەندامەکانی سیمینارێك ساز بکەم، دروست بەرلە دەسپێکی لێدوانەکە من بەخاتو دولین کەسەرۆکی ئەو جڤانە بود ناسێنرام. ئەو وتی: "حاڵت چۆنە؟"

من وتم : "باشم، سوپاس."

خاتو دولین، بزەیەکی کردو چاوەڕێ بوو من قسەیەك بکەمو کارامەیی خۆم لەبەستنی پەیوەندیدا دەربخەم. لێم پرسی خەڵکی کوێیە تاکو دەرگای

ئاخاوتن والا بێت، ئەو لەوەلامدا وتی: "کۆلۆمبس، ئۆهایۆ" هات بەخەیاڵمدا باسی کەسێك بکەم بەناوی جیف کەوتاربێژێکی نایابەو لەکۆلۆمبس دەژی، بەلام کۆلۆمبس شارێکی گەورەیە ڕەنگە خاتو دولین نەتوانێ ئەو بناسێت، لەمەگەڕێین. ڕەنگە تەنها منالان تووشی یاریی "تۆ فلانە یاری دەزانیت؟" ببن. هەروەها بیرم لەدۆزینەوەی ڕستەیەك دەکرد، بەبڕوای من ئەم ناوە لەناوی کریستف کۆلۆمبەوە هاتبێت.بەلام دڵنیا نیم. باشترە واز لەم قسەیەش بێنم، چوار پێنج بابەتی دیکە هات بەخەیاڵمدا بەلام هەستم کرد ئەوانە بەدەردی من ناخۆن.چەن ساتێك بەمشێوەیە تێپەڕی خاتو دولین هێشتا بزەیەك لەسەر لێوەکانی بوو چاوەڕێی قسەی تایبەتی من بوو کەدەبوو تاکاتژمێرێکی دیکە بۆ هاوکارەکانی دەربارەی جۆری بەستنی پەیوەندی قسە بکەم.دواجار توانیم قسەیەك بکەم، بەلام لەو کاتەدا تەکنیکێك هات بەمێشکمدا.

### تەنیکی ژمارە ١٥

**دەربارەی شارەکەت بدوێ**

**هەرکاتێ لێت بپرسن "تۆ خەڵکی کوێیت؟" هێندە بەس نییە باسی شوێنی ژیانت بکەیت. چەن باشترە ئامآژەیەك بۆ ڕوداوێکی پەیوەست بەشارەکەتەوە بکەیت. دوای ئەوەی وتت خەڵکی کام شاریت یەك دوو ڕستە دەربارەی شارەکەت بڵێ، بەمجۆرە ڕەفتارە پسپۆڕێکی پەیوەندیەکان دەردەکەویت.**

**تلمی جیاواز بۆ میگۆ یان کوسە ماسی:**

ماسیگرەکان ئەگەر بیانەوێ ماسییەکی بچوك ڕاو بکەن، یەك تامەو ئەگەر بیانەوێ کوسەیەك ڕاو بکەن سوود لەتامێکی دیکە دەبینن. تۆش لەمیانەی گفتوگۆکردنی خەڵکیەوە دەبێت ئاگات لەم پرسە بێت.

ڕونتر، دەبێت بزانیت لەگەڵ چ کەسێك قسە دەکەیت. ئەگەر کەسێك لەمۆزەخانەیەکدا لێی پرسیت خەڵکی کوێیت دەتوانیت بۆنمونە لەوەڵامدا بڵێیت: "من خەڵکی واشینگتۆن دیسی" م، دەزانی هەمان ئەو کەسەی ئەم شارەی دروست کرد هەمان ئەو کەسە بوو پاریسی دروست کرد، بەم قسەیە باسێك بۆ قسەکردن دێتە ئاراوە، دەتوانیت دەربارەی دروستکردنی شارەکان، سەفەر بۆ ئەوروپا، بابەتێکی دیکە بدوێیت.

دیارە ئەگەر لەمۆزەخانە نەبیت بۆ نمونە لەمیوانیەکدا کەسێك لێت بپرسێت خەڵکی کوێیت، دەتوانیت بڵێیت: "من خەڵکی واشینگتۆن دی سیم." پاشان باسی بابەتێکی کۆمەڵایەتی ئەوشارە بکەیت.

ئەگەر لەنێو دەستەیەکی سیاسەتمەداردا بم دەربارەی دۆخی سیاسی واشینگتۆن دەدەوێم.

ئەگە لەگەڵ کەسێکی هونەرمەند بدوێیت پێی بڵێ: "جۆرج بلوز وێنە کێش سەردەمێك لەکۆلۆمبۆس دەژیا."

## ١٦

### کاتێ لێت دەپرسن چ کارەیت؟
### وەك براوەیەك خۆت بنوێنە

پرسیارێك زۆربەی ئاشنا نوێکان لێت دەکەن ئەمەیە: "چ کارەیت؟" هەمانشێوە لەباسی پێشوو "خەڵکی کوێیت؟" وتم ، بەس نییە لەوەڵامی ئەم پرسیارە بڵێیت: "من ژمێریام"، "من نوسەرم."و ناتەوێ کە پرسیارکەر ناچار بێت لەتۆ بپرسێت بۆنمونە چ بابەتێك دەنوسیت. یان لەکوێ کاری ژمێریاری دەکەیت.

ناتەوێ پرسیارکەر وابزانێ تۆ بەڕاستی چ کارێك دەکەیت، چەن باشترە خۆت کەمێ زیاتر دەربارەی کارەکەت ڕونکردنەوەت هەبێت، بۆ نمونە ئەگەر مافناسێك یان بریکارێك بیت، دەتوانیت بڵێیت:

"من بریکارم. کۆمپانیاکەمان لەبواری مافی کرێکاردا تایبەتە، من کار لەدۆسیەیەکدا دەکەم کەیەکێ لەکۆمپانیاکان یەکێ لەکارمەندە ژنەکانی لەسەر ئەوەی مۆڵەتێکی زۆری منالبونی خواستووە لەکارەکەی دەریکردووە."

☆ تەکنیکی ژمارە ١٦

**تەنها وتنی کارەکەت بەس نییە**

کاتێ لێت دەپرسن "چ کارەیت؟" ڕەنگە بێت بەخەیاڵتدا کە"من ئابوریناس، مامۆستا، ئەندازیارێکم." لێرەدا باشترە زانیاری زیاتر دەربارەی کارەکەت بڵێیت تاکو مەیدانی گفتوگۆ زیاتر بڕەخسێت. دەربارەی ئەو کارەی دەیکەیت زنیاری زیاتر بدە بەدەستەوە. بێجگە لەم شێوەیە ئەو کەسەی پرسیارت لێدەکات ڕەنگە هێندە لەباسەکە لابدات لەجیاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ تۆ بچێتە سەر بابەتی خۆراک.

بیرەوەری تاڵ لەبواری کارەکەتدا:

بیرمە ڕۆژێك لەئێوارە خوانێك لەسەر مێزی نانخواردن لێم پرسی: "چی دەکەیت؟" ئەو لەوەڵامدا وتی: "من زانای ئەتۆمم" شتێك نەهات بەخاڵمدا بێجگە لەوەی بڵێم: "چەن نایابە."

کەسێکی دیکە لەتەنیشتمەوە وەستابوو لەوەڵامی پرسیارەکەمدا وتی: "من لەدروستکردنی مادەی جوانکاریدا کاردەکەم." پاشان چاوەڕوان بوو من بکەوومە ژێر کاریگەریی قسەکەیەوە.

هەرکاتێ کەسێك دەربارەی کارەکەت پرسیارت لێدەکات بۆی ڕونبکەرەوە تاکو بتوانێت کەمێ تێکەڵاویی بکات.

## ١٧

## چۆن کەسەکان بەخەڵکی بناسێنین

گرنگە هەست بەکەسانێك بکەین بۆ یەکەمجار دێنە نێو کۆمەڵێکەوە. "سوزان، حەز دەکەم تۆ بەجان ئیسمیت بناسێنم. جان، ئەمە سوزان جۆنزە."
چاوەڕوانی ئەوە دەکەیت ئەم دوو کەسە پێکەوە چەن قسە بکەن؟
سوزان‌و جان لەبەر قسە نەکردنیان پێکەوە سەرزەنشتیان مەکە، لەم نێوانەدا خەتای کەسێکە بەیەکیان ناناسێنێت. براوە مەزنەکان ڕەنگە زۆر قسە بکەن. بەڵام گفتوگۆی ئەوان لەناکاوو هێشتا دەست پێنەکردوو نایەتە کۆتایی. بزانەو هەرگیز کەسەکان بەدوو وشەی ناوبردنیان بەیەکتری مەناسێنە: "سوزان، حەزدەکەم بتناسێنم بەجان، جان بەلەمێکی نایابی هەیە. هاوینی پار پێکەوە گەشتێکمان کرد. جان، ئەمە سوزانە.
سوزان سەرنوسەری گۆڤاری...ە."ئەمجۆرە ناساندنە دەرفەتێك بەسوزان دەدات تاکو دەربارەی بەلەمەکەی پرسیار لەجان بکات بڵێت: "پار هاوین لەگەڵ ئەو دەستەیەدا بۆ کوێ چوون." جان ئەو دەرفەتەی دەبێت تاکو حەزو خولیای بۆ نوسین یان چێشت لێنان یان هەرشتێك لەبارەیەوە بدوێت.

**تەکنیکی ژمارە ١٧**

**ناساندنی دوو وشەیی مەکە**

**کاتێ کەسەکان بەیەك دەناسێنیت، قولاپی بێ مەزە مەخەرە نێو ناو لەناساندنی کەسەکان بەیەکتری هێندە بەس نییە ناوی ئەوان بێنیت، چەن باشترە بابەتێك بۆ هەردولایان باس بکەیت تاکو دەرگای ئاخاوتن والآتر بێت.**

ئەگەر پێتخۆش نییە لەمیانەی ناساندنی کەسەکان بەیەکتری کارو پیشەیان باس بکەیت، دەتوانیت بەسەرگەرمییەکان، خولیاکانیان ئامآژە بکەیت.

## ١٨

## چۆن گفتوگۆیەکی مردوو زیندو بکەینەوە

هەرگیز لەهاوکاران مەپرسە: "ئایا ئەم گفتوگۆیەت بەدڵە؟" بەهاوکاری ئەم ڕەوشەی ژێرەوە پشویەك بەزەینی خۆت بدە. تۆ دەتوانیت گفتوگۆی خۆت لەگەڵ ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ دەکەیت گەرمتر بکەیت.

وریای قسەی کەسانیتربە:

هاوڕێیەکم هەیە بەناوی نانسی پەرستاری خانەی پیرانە. نانسی گرنگیەکی زۆر بەم بەساڵاچوانە دەدەت. باوەڕی وایە قسەکردن لەگەڵ هەموویاندا ئاسان نییە. ئەو لەبەستنی پەیوەندی بەهەندێك لەم پیرانەوە دژواری هەیە.

نانسی ئاماژە بەیەکێ لەم پیرانە دەکات بەناوی ئۆتیس. کەپەیوەندی بەستن بەم کەسەوە بەلایەوە دژوار بوو.

نانسی دەڵێت: "دروست دوای گەردەلولێکی بەتین بەخاتوو ئۆتیسم وت هەفتەی پێشوو گەردەلولێکی مەترسیدارمان هەبوو وانییە؟ نانسی لەدرێژەی قسەکەیدا وتی: خاتو ئۆتیس وەك دەست بخاتە گەرووم. ئەو وتی: بۆ گوڵو گیا باش بوو."

نانسی لەوباوەڕەدا بوو جۆری وەڵامدانەوەی خاتو ئۆتیس قسەکەی پێ تەواو کرد.

"ئایا هەرگیز لەخاتو ئۆتیست پرسیوە گوڵو گیای خۆشدەوێت؟"

"گوڵو گیا؟"

وتم: "بەڵێ، گوڵو گیا. خاتو ئۆتیس دەستیکرد بەباسکردنی گوڵو گیا." دواتر لەنانسی کرد چاکەیەکم لەگەڵ بکات. "ئەم پرسیارە لەو بکات." نانسی لەبەرامبەر ئەم خواستەی من بەرگری نواند بەڵام من جەختم کردەوە سەرەنجام نانسی بەڵێنیدا ئەم کارە بکات.

رۆژی دواتر نانسی لەشوێنی کارەکەی خۆیەوە تەلەفۆنی بۆکردم: "لیل، چۆن زانیت نەك تەنها خاتو ئۆتیس گوڵو گیای خۆشدەوێت بەڵکو هاوسەرگیری لەگەڵ باخەوانێکدا کردووە، ئەمرۆ لەگەڵ خاتو ئۆتیسدا مەسەلەیەکی جیاوازم هەیە. نەمتوانی دەمی خۆم بگرم. ئەو هەتا توانی دەربارەی درەختو گوڵو گیاو مێردەکەی قسەی کرد..."

بەستەری پەیوەندی باش چاك دەزانێ بیرو باوەڕ خۆ بەخۆ دەرنابڕێت. ئەگەر خاتو ئۆتیس باسی گوڵو گیای کرد دیارە دەربارەی گوڵو گیا پەیوەندیەکی باشی هەیە کاتێ باسی گوڵو گیا هاتە پێشەوە حەزی دەکرد لەبارەیانەوە بدوێت.

بەڵام ئەگەر خاتو ئۆتیس لەوەڵامی نانسیدا بیوتبایە: "لەبەر ئەم بارانە سەگەکەم ناتوانێ بچێتە دەرەوە." نانسی دەیتوانی دەربارەی سەگەکەی ئەو بدوێت. ئەگەر خاتو ئۆتیس بیوتبایە: "باران شتێکی ناخۆشە." ئایا دەزانی نانسی دەبوایە لەبارەی چییەوە قسەی بکردبایە؟کاتێ لەگەڵ کەسێك دەدوێیت، گوێیەکانت بکەرەوە. بەدوای سەرەداوێکدا بگەڕێ بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆکان.

ئەگەر دوو کەس خاڵێکی هاوبەشیان هەبێت، کاتێ باسێکی دڵخواز لەنێوان ئەو کەسدا بێتە ئاراوە هەردوولا لەبارەیەوە دەدوێن.

هێندە بەسە سەرنجی وشەکان بدەیت. وریای وشەکانبە، ئەگەر لەسەر وشەکانی دڵخوازی هەردوولا چڕببیتەوە ئەوا بزانە قسەکانتان تەواو نابێت.

### تەکنیکی ژمارە ١٨

**وریای وشەکانبە**

**سەرنجی یەك بەیەکی ئەو وشانەی لایەنی بەرامبەر پێی دەدوێت بدە. بەمجۆرە هەروەك شرلوك هولمز تووشی بابەتێك دەبیت کەبۆ لایەنی بەرامبەر گەلێك شایانی سەرنج بێت.**

ئێستا دوای باسکردنی زیندو ڕاگرتنی گفتوگۆ با تەکنیکێك شیکار بکەین تاکو باسەکە گەرمتر بکات.

## ☆ ١٩

### چۆن بەباسکردنی بابەتێك ئەوان تامەزرۆی گفتوگۆ بکەیت

چەن ساڵێك بەر لەئێستا لەگەڵ هاوڕێیەکم بەشداری میوانیەکمان کرد. لەگەڵ
هەر کەسێك دەدوایـن لـەوە دەچـوو ژیـانێکی نایـابی هـەبێت. لـەکۆتایی
میوانیەکەدا لەهاوڕێکەم پرسی: "رایان، ئەو کەسانەی قسەت لەگەڵ کردن
کامیان نایابتر بوون؟"
رایـان بـەبێ سـاتێك دودڵ بـوون وەڵامیدایـەوە: "لەهـەموویان زیـاتر دان
ئیسمیت." وتم: "دان، چی دەکات؟"
وتی: "ئەوەی راستی بێت منیش نازانم."
"لەکوێ دەژی؟" "نازانم."
"حەزی لەچ شتێکە؟" "دەربارەی حەزی ئەو قسەمان نەکرد."
"دەربارەی چ شتێك قسـەتان کـرد؟" "وابـزانم دەربـارەی مـن قسـەمان کرد."
لەدڵی خۆمدا وتم ڕەنگە چەن مانگێکی دیکە ئەم دوانە پێکەوە پەیوەست بن.
چەن مانگێك دواتر چـاووم بـەدان کەوتـەوە. دەربـارەی ژیـانی پرسـیارم لێکرد
دەرکەوت دان لەپاریس دەژی لەباشوری فەرەنسا ماڵەکەی نزیك دەریای هەیەو
ماڵێـك لەناوچـە کوێسـتانیەکەی ئاڵـپ، ئـەو بـۆ دورتـرین شـوێنی دنیـا سەفەر
دەکاتو بەرنامەی دەنـگو ڕەنـگ لەسـێ ئەهرامەکـەو شـوێنە ویرانـەکانی دنیا
ئامادە دەکات. ئەو لەفڕین بەگلایدر چێژ دەبینێت. ئەسکێتبازێکی نایابی سەر

ئاوە. ئایا ئەم پیاوە ژیانێکی نایابی هەیە؟ دان لەکاتی چاوپێکەوتنی بەرایان دەربارەی خۆی قسەی نەکردبوو.

بەدانم وت: رایان گەلێك لەدیتنی ئەو ڕازی بوو بەمەش دەربارەی ژیانی ئەو شتێك نەوترا. دان وتی: "کاتێ بۆ یەکەمجار کەسێك دەبینم، حەز دەکەم دەربارەی خۆیو ژیانی زانیاری بەدەست بێنم."

کەسانی دڵنیاو خاوەنی متمانە بەمجۆرە هەڵسوکەوت دەکەن.

**خۆت بەڕەوشەکانی فرۆشی پێشکەوتوو، بەفرۆش بگەێنە:**

چەن مانگێك بەر لەئێستا لەکۆنگرەیەکی تایبەتی وتاربێژان قسەم لەگەڵ برایان تریسی هاوکارم کرد. کاری تریسی پەروەدەی فرۆشیارە گەروکانە. ئەو باوەڕی وایە فرۆشیاران زیاتر لەوەسفی کاڵاکانیان دەبێت وەسفی کریارەکانیان بکەن. فرۆشیاران، ئەم ڕەوشە ئەم ڕەوشە بەتایبەت بۆ ئێوە گرنگە. تەنها کەمێ سەرنج بدەنە کاڵاکانتان بەڵام تابۆتان دەلوێت کریار بخەنە ژێر سەرنجەوە.

**☆ تەکنیکی ژمارە ١٩**

**چرای گەڕۆك**

**کاتێ لەگەڵ کەسێك دەدوێیت. گریمانەی ئەوەت هەبێت چرایەك لەنێوانتاندا دانراوە، کاتێ تۆ ئەدوێیت چرا ڕوی لەتۆیە، کاتێ ئەو ئەدوێت ڕووی لەوە، هەرچەن چراکە ڕووی لەبەرامبەر بێت ئەو تۆ بەنایابتر ئەبینێت.**

☆ ٢٠

## چۆن هەرگیز بیر لەوە نەکەیتەوە "ئێستا بڵێم چی؟"

کاتێ وادێتە پێشەوە تەنانەت کەسانی دەمو زمانزان و قسەزانیش سەریان لێ دەشێوێت. ئەگەر هەستت بەوەکرد قسەیەکت بۆ وتن پێ نییە تاکو گفتوگۆی مردو زیندو بکاتەوە، ئەگەر هەستت کرد بەهۆی سیاسی یان هەر پاساوێکی دیکەوە دەبێت کارێکی وابکەیت گفتوگۆ بێتە ئاراوە، بەم ڕەوشەی ژێرەوە دەست پێبکە من ناوەوم ناوە ڕەوشی توتی هەمان ئەو باڵندە جوانەی لەگەرمەسێردا ژیان دەکات هەر قسیەك بکەیت ئەو دوبارەی دەکاتەوە.

هەرگیز بۆ سەیرکردنی یاری تێنس دانیشتویت؟ بەردەوام تۆپەکە بەسەر تۆڕەکەدا لەهاتوچۆدایە بەمشێوەیە لەئاخاوتن لەگەڵ کەسانیتر تۆش قسەیەك دەکەیت کەسی بەرامبەریش بەوردبونەوەی لەقسەکانت وەڵام دەداتەوە. پاشان نۆبەی قسەی دوبارەی تۆ دێتەوەو پاشان... بەدەنگی وەك "ئێ، وابە" وەڵامی کەسی بەرامبەر دەدەیتەوە کەتۆپەکە هاتۆتە زەویەکەی تۆوە. لەڕاستیدا ئاماژە دەکەیت کە: "ئاگات لێیە."

پاشان چی بڵێم؟ ڕەنگە کاتێ نۆبەی تۆ دێت، زەینت لەکار بکەوێت. هەرچی بیر دەکەیتەوە وەڵامێکت بۆ کەسی بەرامبەر پێ نییە. مەترسە. هەروەك توتی دوسێ وشەی کۆتایی کەسی بەرامبەر دوپات بکەرەوە. ڕیتمی قسەکەت دەبێت

بەچێژ بێت‌و حاڵەتی پرسیار بەخۆیەوە بگرێت بەمجۆرە دوبارە تۆپەکە بۆ ئەو دەهاوێژێتەوە.

هاوڕێم فیلیپ، جاری واهەیە بۆ پێشوازیم دێتە فرگە، زۆرجار هێندە ماندووم لەتەنیشت شۆفێرەکەوە خەووم دێت لەم حاڵەشدا فیلیپ دەبێتە شۆفێرێك.

چەن ساڵێك بەر لەئێستا دوای گەشتێکی ماندوئامێز جانتاکەم کردە ئۆتۆمبیلەکەی فیلیپ بەپەلە خۆم گەیاندە نیشتۆکی پێشەوە، هاوکات خەون زابویە چاوەکانم، فیلیپ باسی ئەو شانۆیەی دەکرد کەشەوی پێشتر بینی بووی. من کەتازە ئاشنای ڕەوشی توتی بووم، وتم: "شانۆ؟" "بەڵێ، نمایشێکی زۆر خۆش بوو." "نمایشی خۆش؟" فلیپ لەحەزو خولیای من بەشانۆ هاتبویە هەژین وتی: "بەڵێ، نمایشی نوێی ستیڤن سوندیم. ناوی شانۆکە سوییینی تادە." "سوییینی تاد؟" جارێکیتر سوودم لەڕەوشی توتی بینی. فیلیپ خرۆشابوو تەواو گەرم بوبو. "بەڵێ، مۆسیقایەکی جوان‌و چیرۆکێکی ناباوەڕی." "چیرۆکێکی ناباوەڕیی؟" ئەمە هەموو ئەو شتەیە کەفیلیپ پێویستی پێی بوو. لەماوەی نیو کاتژمێری دواتردا فیلیپ هەموو ڕوداوەکەی بۆ گێڕامەوە.

ئێستا وەك توتی دوایین قسەی ئەووم دوپات کردەوە بەڕێتمی پرسیار. "مۆسیقای جوان؟ وتت موسیقاکەی جوان بوو؟"

ڕەشی من کاریگەر بوو. لەماوەی چل‌و پێنج خولەك تاکو گەشتینەماڵەوە فیلیپ ئاهەنگی "ژنی جوان"، "باشترین کێکی لەندەن" گۆرانیەکانیتری سوییینی تادی بۆ ووتم. دڵنیام تاکو ئەمڕۆش فیلیپ لەوباوەڕەدایە باشترین ئاخاوتنی لەگەڵ مندا کردووە. تەنها کارێك من کردم ئەمە بوو سوود لەڕەوشی توتی ببینم.

تەکنیکی ژمارە ٢٠

**ڕەوشی توتی**

**هەرگیز وامەزانە تۆ بابەتێکت پێ نییە، وەك توتی، دوو سێ وشەی کۆتایی کەسی بەرامبەر دوپات بکەرەوە. دوایی ئەوەی پێویستت پێیەتی گوێگرتنە.**

**بەکار بردنی ڕەوشی توتی سوود وەربگرە**

ڕەوشی توتی دەتوانێ کاریگەری لەسەر کەسەکان هەبێت. فرۆشیارە نایابەکان هەوڵ دەدەن وەڵامی ڕەخنەی کڕیارەکان بدەنەوە ئەمەش یەکێکە لەو دەسپێکانەی شێوەی خۆی وەردەگرێت. پاڵ، یەکێکە لەهاوڕێ نزیکەکانم فرۆشیاری دەستی دووەمی ئۆتۆمبێلە، ڕوونی دەکاتەوە چۆن بەبەکاربردنی ڕەوشی توتی توانی فرۆشێکی نایاب بکات. لەگەڵ موشتەریو هاوسەرەکەی چوونە پارکینگی فرۆشگاوە. موشتەری پێی وتبوو کە "ئۆتۆمبێلێکی دڵخوازی خۆی دەوێت". ئەو هەموو شۆفرلێتو فۆردانەی لەپارکینگدا وەستابوون نیشانی ئەویدا لەکاتێکدا بەدوای ئەو ئۆتۆمبێلە دڵخوازەدا دەگەڕان. پاڵ پرسیاری لەمێردی ژنەکە کرد بیر لەچی دەکانەوە. وەڵامیدایەوە: "باوەڕ ناکەم ئەم ئۆتۆمبێلە بۆ من گونجاو بێت." پێش ئەوەی بچنە لای ئۆتۆمبێلێکی ترەوە پاڵ، وتی: "گونجاو بۆ تۆ؟" "بەڵێ، لەوەناچێت لەگەڵ کەسێتی مندا گونجاو بێت." "لەگەڵ کەسێتی تۆدا گونجاو بێت؟" "لەوانەیە ئۆتۆمبێلێکی سپۆرتترم پێویست بێت." "کەمێ سپۆرتتر؟"

"زۆر باشە ئەوانەی لەوێ دەیانبینیت سپۆرتترن."

کاتێ پاڵو موشتەریەکانی چوونە لای ئۆتۆمبیلی دواتر لامبور گینی بوو، چاوەکانی موشتەری زەق بوو.

٢١

## چۆن بۆ قسەکردن هانی کەسانیتر دەدەیت

## "بەجۆرێك ئەگەر بتەوێ لێیان دورکەویتەوە"

زۆرجار ڕێدەکەوێ باوکێك لەکاتی خەواندنی منداڵەکەیدا چیرۆکی بۆ دەخوێنێتەوەو دوایی منداڵەکەی داوای لێدەکات جارێکیتریش چیرۆکەکەی بۆ بگێڕێتەوە. باوك دەزانێ منداڵەکەی ئەم چیرۆکەی پێخۆشەو ئێستا دەیەوێ دوبارەو چەنبارە گوێی لێ بگرێتەوە. منداڵان حەزیان لەڕەوشێکە من ناووم لێناوە "دوبارە". ئەم ڕەوشە دوو ئامانج دەپێکێت. دوبارەکردنەوە دەبێتە هۆی باوك خۆی بەکەسێکی سەرکەوتوو بزانێ و بەگفتوگۆی مردوو گیانێکی نوێ بەبەخشێتەوە. جارێك لەسەر کەشتیەك کارم دەکرد کەژمارەیەك ئەفسەرانی ئیتالی و ئەمریکایی سەرنشین بوون. هەموو هەفتەیەك ئەفسەران دەبوو بەشداری میوانداری کەشتیەوانەکەیان بکردبایە، دوای ئەوەی کەشتیوان بەزمانێکی ئینگلیزی تێکشکاو قسەی دەکرد. ئەفسەران لەدەوری یەکتر کۆ دەبونەوە تاکو قسەی کەشتیوان بۆ یەکتریی دوبارە بکەنەوە.

وەك بەڕێوەبەری کەشتیەکە خرایە ئەستۆی من داوا لەئەفسەرەکان بکەم بەخێرهاتنی گەشتیاران بکەن. ڕەوشی من ئەمە بوو دەستی ئەفسەرێك بگرم لەگەڵ ئەو گەشتیارەی بزە لەسەر لێوەکانێتی ئاشنای بکەم پێکەوە قسە بکەن.

شەوێکیان لەکابینەی خۆمدا خەوتبووم، لەتەکانی بەتینی کەشتییەکە بێدار بوومەوە. گوێم گرت، ماتۆڕەکانی کەشتیەکە کوژابونەوە. نیشانەیەکی خراپ بوو. خۆم گۆڕیو بەپەلە چومە سەر ئەرشی کەشتیەکە لەنێوان هەراو زەنایەکی زۆردا بەزەحمەت بینیم کەشتییەکی دیکە لەفاسیلەی نیو میلەوە لێمان نزیك بۆتەوە. پێنج شەش کەس لەئەفسەرانی کەشتی لەدواوە چەمی بوونەوە. لەم کاتەدا کەسێکم بینی بەدەمو چاوێکی چەورەوە بەپەیژەی کەشتییەکەدا سەرکەوت. ئەفسەران ڕێنماییان کرد بۆ نەخۆشخانەی کەشتییەکە. ماتۆڕەکان دوبارە کەوتنەوە کار ئێمە بەرێ کەوتینەوە.

بۆ سبەینێ ڕوداوەکەم بیست. یەکێ لەکارمەندانی کەشتیەکی بارهەڵگر لەسەر یەکێ لەماتۆڕەکانی کەشتی کاری دەکرد پارچە ئاسنێك وەك موشەك لەچاوی دەدات، کەشتییە بارهەڵگرەکە پزیشکی لەگەڵ نابێتو بەم هۆیەش حاڵەتی فریاکەوتن ڕادەگەیێنێت.

بەپێی بنەما دەریاییەکان هەرکەشتیەك ڕاگەیاندنی حاڵەتی کتو پڕ ببیستێت دەبێت کاردانەوەی هەبێت، کەشتییەکەی ئێمە فریای کارمەندە بریندارەکە کەوت، بریندارەکە خوێن بەچاویدا دەهاتە خوارەوە بەهۆی بەلەمی فریاگوزارییەوە بەرەو ئێمە دێت تاکو فریای بکەوین. پزیشکەکەی ئێمە توانی ڕزگاری بکات.

"بەسەرهاتەکەیان بۆ... بگێڕەوە"

جارێکیتر لەمیانەی میوانیەکی کەشتیدا هانی ئەفسەرانم دەدا گفتوگۆ لەگەڵ گەشتیاران بکەن. ئەمجارە نۆبەی پزیشکی کەشتی بوو لەسەر ئەو کار بکەم. ئەووم بردە لای دەستەیەك لەگەشتیارانەوە پێم ناساندنو پاشان وتم دکتۆر ڕوسی هەفتەی پێشوو چاوی دەریاوانێك کەلەکەشتیەکی تردا کاری دەکرد

چاککردەوە پاشان وتم: "دکتۆر روسی، دڵنیابە ئەم کەسانە دەیانەوێ ڕوداوەکە لەزمانی خۆتەوە ببیستن."

وەك گۆچانێکی جادویی. لەهجەو زمانی نیوەکارەی دکتۆر رۆسی لەناکاو گۆڕا بەدرێژی کردار چارەسەرکردنی کارمەندە بریندارەکەی بۆ ئەو گەشتیارانەی لەدەوری کۆ بوبونەوەو هەرساتەو ژمارەیان زیاتر دەبوو گێڕایەوە.

پاشان چووم بۆلای کەشتیوانەکە دەستیم گرتو بردمە لای دەستەیەکیتر لەگەشتیاران و وتم: "کەشتیوان، کافیرۆ بۆچی بەسەرهاتی ڕزگارکردنی کارمەندە بریندارەکە بۆ گەشتیاران ناگێڕیتەوە؟" ئیدی کەشتیوانەکە بەوپەڕی هەژینەوە دەستی بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کرد.

پاشان چوومە لای ئەفسەری یەکەمی کەشتیەکە تاکو بیناسێنم بەدەستەیەکی دیکە. "سینیور سالواگو، بۆچی بۆ ئەم گەشتیارانە باسی ناکەیت چۆن هەفتەی پێشوو لەنیوەی شەودا کەشتیوانەکەت بێدار کردەوە هەواڵی ڕاگەیاندنی حاڵەتی فریاکەوتنت پێدا؟"

ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو بچمە لای دکتۆرو بەدەستەیەکی دیکەی بناسێنم. ئەمجارەیان باشتر لەجاری یەکەم سەرگەمی قسەکردن بوو لەگەڵ گەشتیارەکان. چوومە لای کەشتیوان تاکو بۆ بەرنامەی کاری دواتری ئامادەی بکە.لەوتەواوی ماوەی وەرزەکەدا کەشتیوان و ئەفسەری یەکەمی کەشتی گەشتیارانیان بەباسی ڕزگارکردنی کارمەندە بریندارەکەوە سەرگەرم کرد. تەنها باسی بەسەرهاتەکە بەردەوام ڕوونتر درێژتر دەکرایەوە.

سەرلەنوێ لێی بدەوە، سام:

ڕەنگە ئاوازخوێنێك لەکاتێکدا ئاواز بۆ کۆمەڵێك دەخوێنێت، لەلایەن ئامادەبوانەوە ستایش بکرێت داوای لێبکەن ئاوازێکی دیکە بخوێنێت.

بەمشێوەیەش ڕەنگە کەسێك شیعرێك بخوێنێتەوە کۆپلەیەکی دواتریش بخوێنێتەوە. دەتوانیت بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵ کەسانیتر سوود لەم ڕەوشە ببینیت. "سوزان، بەسەرهاتی ڕزگارکردنی ئەو بێچوە پشیلەیە بۆ هاوڕێکەمان بگێڕەوە." ڕەنگە ئەو کەسەی داوای لێدەکەیت لەسەرەتاوە پێی خۆش نەبێت. بەڵام تۆ جەخت لەسەر قسەکەت بکەرەوە. ئەو کەسەی داوای لێدەکەیت لەراستیدا پێشوازی لەم داوایەی تۆ دەکات تۆ لەڕاستیدا پێی دەڵێیت: "بەسەرهاتەکەی تۆ نایابە. حەزدەکەم ئەوانیش بزانن."

**تەکنیکی ژمارە ٢١**

**دوبارە!**

**نایابترین دەنگێك وتەبێژێك دەتوانێ گوێی لێبێت ئەمەیە "دوبارە! دوبارە!" نایابترین وشەی کەسێك ئەو بەکەسانیتر بناسێنێت ئەمەیە: "باسەکەیان ... بۆ بگێڕەوە." هەرکاتێ لەکۆڕو کۆمەڵێکدا بویت کەسێکی گرنگ لەکۆمەڵەکەدا بوو داوای لێبکە ئەو بەسەرهاتە سەیرەی لەزمانی ئەوەوە بیستوتە بۆ هەموانی بگێڕێتەوە.**

یەکی لەسوودەکانی ئەم ڕەوشە ئەمەیە کاتێ داوا لەکەسێك دەکەیت باسێك بۆ ئەوانیتر بگێڕێتەو. خۆت ئەو دەرفەتەت بۆ دەڕەخسێت تاکو ئاشنای کەسانی نایابتر ببیت.

بزانە. چیرۆکێك بەکەسێك بگێڕەوە ئەو تێیدا بدرەوشێتەوە. ئەو چیرۆکەی تۆ دەتەوێ بەدوبارەکردنەوەی ڕونتر بێتەوە دەبێت بەلای بیسەرانەوە نایاب بێت. لەڕەوشەکانی دواتردا بەگێڕانەوەی هەندێ لەبەسەرهاتە ئەرێنیەکانی ژیانی خۆتان ئاماژە دەکەین.

## ٢٢

### چۆن وەك كەسێكی ئەرێنی دەركەوین

زۆربەی خەڵكی وادەزانن كاتێ ئاشنای كەسێك دەبن كە پێیان خۆشە دەبێت بابەتێك بگێڕنەوە، قسەیەك بكەن‌و نیشانی بدەن ئەوانیش مرۆڤن.

ئەگەر كەسێكی دەركەوتوو بیت، دەتوانیت هەموو قسەیەك بكەیت‌و سەركەوتوانە كار بكەیت. بەلام ئەگەر كەسێكی دەركەوتوو نیت دەبێت زیاتر پێشبین‌و ڕەچاو كردن بكەیت.

كاتێ لەگەڵ كەسێك پەیوەندی پێشینەت هەیە. لەوەی بڵێین تا ئێستا سێ كەڕەت هاوسەرگیریی كردووە یان لەمناڵیدا لەفلانە فرۆشگا شتێكت دزیوە یان ئەوكارە گرنگەی ویستوتە پێان نەداویت گرفتی ئەوتۆ بەدی ناهێنێت.

بەلام ئەگەر لەگەڵ كەسێك بەوزوانە پەیوەندیت بەستووە ئەمجۆرە قسانە بۆ ئەو بكەیت ڕەنگە ئەم پرسیارەی بۆ دروست بێت دوای ئەمە دەیەوێ چی بڵێت؟

☆ تەكنیكی ژمارە ٢٢

**سەرنجی لایەنە ئەرێنیەكان بدە**

**كاتێ بۆ یەكەمجار كەسێك دەبینیت، وریاتر كار بكە، پاشان دوای ئەوەی پەیوەندیتان بتەوتر بوو، دەتوانیت دەربارەی مەسەلەی دیكە قسەی بۆ بكەیت، بەڵام لەئێستادا ڕەچاوی لایەنە ئەرێنیەكان بكەو لەلایەنە نەرێنیەكان بەدوربە.**

تانێرە ئاشنای ڕەوشەكانی بواری پەیوەندی بەستنو قسەی خۆمانە بویت. لەوەرزی داهاتودا ڕونی دەكەینەوە ئەو كاتەی هەستی ئەوە دەكەین چیتر قسەیەكمان بۆ كردن پێ نییە دەبێت چی بكەینو چی بڵێین.

## ٢٣

### هەمیشە قسەی نایابت بۆ ووتن هەبێت

بێگومان بیستوتە هەندێك دەڵێن: "ناتوانم بچم بۆ میوانیی، جلم نییە لەبەری بکەم." بەلام دواجار کەبیستت کەسێك وتی: "ناتوانم بچم بۆ میوانیی چونکە قسەیەکم نییە بۆ وتن بشێت." کەی بوو؟

کاتێ دەچیتە کۆڕو کۆمەڵێکەوە کەپێك هاتووە لەتۆڕێکی گەورە. ئاساییە جلێکی ڕێكو پێك لەبەر بکەیت دیقەت بدەیت پێلاوەکانت لەگەڵ جلەکاندا ڕێك بکەوێتو کراسو چاکەتو پانتۆڵەکەت بەجۆرێك هەماهەنگ بن. قژت شانە دەکەیت هەموو شتێك ئامادەیەو بەڕێ دەکەویت.

بەلام ئایا باشترین شتێکت بیر نەچووە؟ ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە دەبێت چی بڵێیت تاکو وێنەیەکی باشتری خۆت بنوێنیت؟ ئایا هەرچی بێت بەخەیاڵتدا دەریدەبڕیت؟ هەروەك کاتێ دەتەوێ خۆت بگۆڕیت کوێرانە دەست بۆ تاکی جلەکانت نابەیتو هەرلەخۆتەوە دەستێك جل دەرناکەیت. بۆ ئاخاوتنیش ڕێسایەکت هەبێت.

یەکێ لەو کارانەی دەتوانیت بیکەیت ئەمەیە بەرلەوەی بێیتە دەرەوە گوێ لەبەرنامەیەکی هەواڵ بگرە. بزانە لەم ساتەدا لەدنیادا چی ڕویداوە؟ دەبێت بێ گرێدانە ئەوەی لەگەڵ چ کۆمەڵێکدا بیت قسەیەکت بۆ کردن پێ بێت.

### تەکنیکی ژمارە ٢٣

**بۆ ئەوەی دواین هەواڵ بزانیت لەماڵ مەچۆرە دەرەوە.**

دواین کارێک دوای خۆ گۆڕین و بەر لەوەی لەماڵ دەربچیت ئەمەیە: رادیۆ بکەرەوە گوێ لەهەواڵێک بگرە یان رۆژنامەیەکی ئەو رۆژە هەڵبدەرەوە هەواڵەکانی بزانە. هەر رووداوێک ئەمرۆ رویدا بێت سەرنجکێشە، کاتێ ئاگات لەهەواڵ بێت، ناچار نابیت پرسیاری هەواڵ و دەنگ و باس لەکەسانیتر بکەیت.

## بەشی سێ

## چۆن وەك كەسێكی گرنگ گفتوگۆ بكەین

بەخێر بێیت بۆ جەنگەڵی مرۆیی. كاتێ دوو پڵنگی كێویی پێكەوە بەرێدا دەڕۆن سەیرێكی یەكتریی دەكەن‌و لەخۆیان دەپرسن: "ئەگەر بڕیار بێت ململانێیەك ڕوو بدات، كاممان شانسی مانەوەی زیاترمان دەبێت؟"

بەڵام دنیای مرۆڤ لەگەڵ دنیای ئاژەڵدا جیاوازی هەیەو مرۆڤەكان سەیری یەكتریی دەكەن پاشان قسە دەكەن. لەدنیای بازرگانیدا، ئەو كاتەی هەردولا بزەیەك بۆ یەكتر دەكەن‌و هەواڵی یەكتریی دەپرسن، كاریان هاوشێوەی پڵنگەكانە. ئەوان بەغەریزەوە خۆ بەخۆ دەیانەوێ یەكتری هەڵسەنگێنن. ئەوان بەدرێژی چڕنوك‌و تیژیی ددانەكانیان ئەندازەگیریی ناكەن لەجیاتی ئەوە خاوەنی چەكێكی بەهێزترو كارامەترن بۆ مانەوەی ژیانیان، مرۆڤ بەرەچاوكردنی كارامەیی پەیوەندی بەیەكترەوە دەپێورێن. ٨٥٪ سەركەوتنی كەسێك لەژیاندا پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەكارامەیی پەیوەندی خۆیەوە هەیە.

بەتێبینی ئامارە بڵاوكراوەكان، كاربەدەستان پێوەری هەڵبژاردن‌و دامەزرانیان كارامەیی پەیوەندیەو نەك بڕوانامەو ئەزمونی فێركاریی. ئەوان دەزانن كارامەیی پەیوەندی كەسەكان دەبەنە نوكی قوچەكێك. كەسەكان بەو ئاخاوتنەی لەگەڵ یەكتریی دەیكەن دەزانن كامیان لەجەنگەڵی مرۆییو كامیان لەجەنگەڵی ئاژەڵیدایە. زۆری پێناچێت كەسەكان تێدەگەن كامیان كەسێكی گرنگترن.

تەكنیكە ئامادەكراوەكانی ئەم بەشەی كتێبەكە ڕێنمایتان دەكەن تاكو لەم نێوەندەدا بچنە ڕیزی سەركەوتنەكانەوە. بەكۆمەكی ئەو ڕەوشانەی ڕوونم كردنەوە دەتوانیت گەلێك خێرا نوكی قوچەكی سەركەوتن بگریت.

٢٤

## چۆن دەتوانیت (بێئەوەی پرسیار بکەیت)
## تێ بگەیت ئەوان چی دەکەن

زۆربەی کەسەکان کاتێ بەیەك دەگەن لەهەمان ساتەکانی سەرەتاوە پرسیار لەپیشەی یەکتری دەکەن. بەڵام کەسی زرنگو کارزان بەمجۆرە پرسیار ناکەن بەڵکو بەشێوەیەکی ژیرانەتر دەرك بەمە دەکەن. سەرنجی ئەم خاڵە بدە مرۆڤەکان هەمیشە مەزنترن لەکارەکانیان.
بەرگری نواندن لەهەمبەر ئەم پرسیارە هەستیاری ئەوان نیشان دەدات.
زۆربەی خەڵك بەتایبەت پێیان خۆش نییە کەسێك لێیان بپرسێت چی دەکەن.
لەمەش بترازێین، ملیۆنان ژنی کارامە دایکایەتی کردنیان لەهەرکارێکیتر پێ باشترە بەڵام زۆرێکیان کەدەخرێنە ژێر پرسیارەوە هەستی گوناه دەکەن.
زۆرێکیان لەوە دەترسن پرسیارکەر تەنها ئەم وەڵامەی دەست بکەوێت "من هاوسەرگیریم کردووە."
کوڕانو کچانی لاو ناپرسن"چ کارەیت" گریمانەی ئەوە دەکەن ئەوان کاری گرنگیان هەیەو لەگەڵ کەسانی گەورەدا دەفڕن، لەم دواییان لەکۆڕێکدا بەشداریم کرد ئەو کەسانەی کۆڕەکەیان پێك دەهێنا لەم دەستەیە بوون.
گەشتمە ئەم ئاکامەی کەسەکان هیچیان پرسیاری کارو پیشەی یەکتر ناکەن.

سودێکی دیکەی پرسیار نەکردن "چی دەکەیت و چ کارەیت" ئەمەیە ئەوانە دەگەنە ئەو ئەنجامەی ئەوانت لەبەر خۆیان هەڵبژاردووە بۆ ئاخاوتن نەک لەبەر کارو پیشەکانیان.

☆ تەکنیکی ژمارە ٢٤

**مەپرسە کارت چییە**

**هەوڵبدە لەکەسانیتر نەپرسیت کارت چییە. دیارە دەزانیت بەڵام نەک بەشێوەی پرسیارکردن.**

**ڕێگەیەکی گونجاو بۆ زانیاری چ کارە بوونی کەسانیتر**

بەم پێیە چۆن دەزانیت کەسێك بۆ پەیداکردنی بژێویی چ کارێك دەکات؟ لەجیاتی ئەوەی لەکەسێك بپرسیت" کارت چییە؟" بپرسە: "بەشی زۆری کاتەکانی ڕۆژ بەچی بەسەر دەبەیت؟"

بەمجۆرە پرسیارە کەسەکە دەکەوێتەوە دۆخێکی ئارامترەوە تاکو بڵێت چ کارێك دەکات بەمجۆرە ژنێکی ماڵەوە ئاسانتر وەڵام دەداتەوە. ئیستا وابزانە لەلای کەسێکیت پێی خۆش نییە دەربارەی کارەکەی پرسیاری لێبکەیت، هەندێك لەوانەیە بڵێن: "من هەموو کاتەکانم بۆ کارەکەم خەرج دەکەم." ئەمەش دەرفەتێکت پێدەدات تاکو وردەکاری لەبارەی کارەکەیەوە بزانیت. بۆیە ئەمجۆرە پرسیارە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکان هەر کارێك لەبارەیەوە بۆتان بدوێن.

☆ ٢٥

## کاتێ لێت دەپرسن چ کارێك دەکەیت چۆن وەڵامیان بدەیتەوە؟

٩٩٪ ئەو کەسانەی بۆ یەکەمجار دەیانبینیت لێت دەپرسن: "چ کارێك دەکەیت؟" براوە مەزنەکان هەمیشە دەزانن هەر کەسێك بەهەر شێوەیەك لێیان بپرسێت بۆ وەڵامدانەوە خۆیان ئامادە کردووە.

زۆرێك کارنامەی پیشەیی نوسراوی بۆ هەلی کار پێیەو تێیدا هەموو زانیارییەك تۆمار کراوە.

هاوڕێم رۆبێرتۆ پارساڵ بێکار بوو. ئەو پێشنیاری دوو کاری کرد: بەڕێوەبەری فرۆشی کۆمپانیایەکی بەستەنی فرۆشیو سەرۆکی پلانڕێژی کارگێڕی بۆ فرۆشگایەکی زنجیرەیی کەخواردنی ئامادەکراو دەفرۆشێت. ئەو بەلێکۆڵینەوەی ورد گەشتە ئەوەی وەبەرهێنەری بەستەنی دوچاری کێشەی زۆرەو فرۆشگای مادە خۆراکیەکان ئارەزوی نێو نەتەوەیی درێژخایەن لەسەریاندایە. ئایا ئەو کارنامەی پیشەیی بۆ هەردوو کۆمپانیاکە ڕەوانە کرد؟ هەرگیز! لەو کارنامەیەی بۆ کۆمپانیای بەرهەم هێنانی بەستەنی نارد ڕوونی کردەوە چۆن لەکاری پێشویدا توانیوێتی فرۆشی کۆمپانیا لەماوەی سێ ساڵدا بەدوو بەرامبەر بەرز بکاتەوە، بەڵام بۆ کۆمپانیا خۆراکیەکە نوسی ماوەیەك لەئەوروپا بووە لەزەمینەی وڵاتەکانی دەرەوە زانیارییەکی تەواوی هەیە.

هەردو کۆمپاییاکە پیشنیاری دامەزراندیان بۆکرد. ئێستا ئەو سەردانی هەردوکیانی کردووەو پێی خۆشە کار بۆ هەردوکیان بکات بەڵام لەم نێوەندەدا کۆمپانیایەکی دیکە پێشنیاری دامەزراندنی بۆ دەکات. ئەو توانی لەکۆمپانیای زنجیرەیی خۆراکیدا بەپارەیەکی دوو بەرامبەر دەسبەکار بێت. بۆ ئەوەی لەهەر رووبەرو بونەوەیەکدا باشترین سەرکەوتن مسۆگەر بکەیت کارنامەی کاری خۆت تایبەت بکە بەخۆتەوە لەجیاتی ئەوەی لەوەڵامی "چی دەکەیت" وەڵامێکی کرچ و کاڵ بدەیتەوە دە دوانزە وەڵام بنوسەو هەرکامیان گونجاوتر بوو بەکاری بێنە.

### ☆ تەکنیکی ژمارە ٢٥

**کارنامەی پیشەیی**

**دروست وەك ئەو کەسانەی بەدوای پیشەیەکی باشدا دەگەڕێن و هەرکارێکیان دەسگیر دەبێت کارنامەی بۆ ڕادەکێشن.**

**تۆش دەتوانی بەجۆرێك بدوێیت گوێگرەکانت بەسەرنجدان لەکارو کەسێتی پێشوازیت لێبکەن. لەخۆت بپرسە: ئەم کەسە دەتوانێ پێشنیاری کارێکم بۆ بکات؟ ئایا دەتوانێ شتم لێ بکڕێت؟ من دامەزرێنێت" ببیت بەهاوڕێم؟**

**بۆ هەر جێیەك دەچیت پێناسەیەکی نایابیت بۆ ناساندنی خۆت پێ بێت.**

## ٢٦

## چۆن ژیرتر بیت لەوەی دەردەکەویت

ئایا تا ئێستا ئەوەت بیستووە کەسێك قسەی زل بکات و لەدەمی خۆی زلتر بێت. لەڕەفتارەکەی لێکدانەوەی ئەوە دەکەیت لەوتنی ئەم قسەیە مەستی لەخۆبایی بوون دەکات.

لێکدانەوەی دنیا بۆ کەسانێك قسەی زل دەکەن ئەمەیە ئەوان کەسانێکی کارامەو هۆشمەندترن، کەسانێك زمانی زیاتر دەزانن زوتر دادەمەزرێن خێراتر پلەیان بەرز دەکرێتەوەو خەڵکی زیاتر گوێیان بۆ دەگرن. کەسانی سەرکەوتوو لەوشەی پڕو گەورە سوود دەبینن. بەڵام هەرگیز قسەیەکی نەگونجاو ناکەن. دەربڕینەکان بەشێوەی دڵنشین لەدەمیان دێتە دەرەوە تاکو گفتوگۆکانیان سەرشارو دەوڵەمەند بکات. قسەکان بەجوانی شوێنی خۆی دەگرێت. دروست هەمانشێوە یاریزانە گەورەکانی مەیدانی ژیان جلو بەرگی گونجاو دەپۆشن و هەوڵ دەدەن بەپێی کەسێتی خۆیان بدوێن.

هەواڵی خۆش ئەمەیە جیاوازی نێوان بەکاربردنی وشەی ڕێزدارانەو بێ ڕێزانەو ئاسایی تەنها پێنج وشەیە. بۆئەوەی بچیتە ڕیزی براوەکانەوە هێندە پێویستت بەشتی زۆر نییە، هەر کەبتوانیت چەن وشەیەکی باش و گونجاو بەکاربەریت دەبێتە هۆی ئەوەی کەسانیتر وابزانن تۆ خاوەنی زەینێکی بەدی هێنەریت.

بەدەست هێنانی ئەم زمانەی ئاستی باڵا شتێکی ئاسانە. ناچار نیت کتێبی زمانەوانی بخوێنیتەوە یان لەهجەیەکی تایبەت بدۆزیتەوە، ناچار نیت فێری وشەگەلێك بیت ئەگەر داپیرەت ئەمە بزانێ بەسابون دەمت بشوات.
تەنها کارێك دەبێت ئەنجامی بدەیت ئەمەیە. ئەو چەن وشەیەی رۆژانە بەکاری دەبەیت لێی ورد ببەوە. وشەی وەك بەهۆش، باش، جوانو قەشەنگ، پاشان کتێبی زارلوەی وشە لەکتێبخانەکەت هەڵگرە بزانە لەجیاتی ئەو وشانەی پێشتر بەکارت هێناوون لەوشەیەکی دیکە سوود دەبینیت، ئەمجارە کاتێ دەتەوێ وشەی زیرەك بەکار بێنیت سوود لەهاوشێوەکەی ببینە.

### چەن وشەیەك بۆ پیاوان

بەرێزان، ئێمەی ژنان کاتێکی زۆر لەبەر ئاوێنەدا خەرج دەکەین. کاتێ دەچووم بۆ کۆلێژ، بەرلە چاوپێکەوتنی هاورێکانم ١٥ خولەك لەبەر ئاوێنەدا دەوەستام بەڵام ئێستا کاتەکە زیاتر بووە جاری واهەیە بۆ بەشداریکردنم لەمیوانیەکدا یەك کاتژمێرو نیو لەبەر ئاوێنەدا دەوەستم.
بەرێزان، ئەگەر بینیتان هاوسەرەکەتان خۆی ئامادە کردووە لەپلەکان دێتە خوارەوە تاکو پێکەوە بەشداری مەراسیمێك بکەن، چی بەو دەڵێیت؟ ئەگەر بڵێیت: "بۆ رۆشتن ئامادەیت؟" بزانە چ کاریگەرییەك لەسەر ئەو دادەنێیت.
هاورێم گری پیاوێکی باشە جار جار ئێوارە خوانێکم بۆ ساز دەکات. نزیکەی دوانزەجار پێشر ئەووم بینی. یەکەمجار کەبینیم هەرگیز بیرم ناچێتەوە. ئەو وتی: "لیل، نایاب دەردەکەویت." ستایشی ئەو کاردانەوەیەی ئەووم کرد.
نزیکەی مانگێك دواتر بینیمەوە ئەو هەمان دەبرینی پێشوی دوبارە کردەوە: "لیل، نایاب دەردەکەویت." دوبارە بەو قسەیە خۆشحاڵ بومەوە. ئێستا

دوانزە ساڵ بەسەر ئاشنایەتیماندا تێدەپەڕێت. دوو مانگ جارێک ئەو دەبینم هەرجارێك ئەو هەمان قسە دەکاتەوە.

لەمیانەی سیمینارەکانمدا بۆ ئەوەی هاوکاری پیاوان بکەم تاکو هەڵەی گرن دوبارە نەکەنەوە. لەهەموو پیاوان داوا دەکەم وشەی هاوشێوە بۆ جوان و نایاب بدۆزنەوە. پاشان یەك ژن و چەند پیاوێك بانگ هێشت دەکەم بۆ شوێنێك بلو لەهەموو پیاوان دەکەم وانیشان بدەن مێردی ئەو ژنەن. داوایان لێدەکەم وابزانن دەیانەوێ لەگەڵ هاوسەرەکەیان بۆنانخواردن بچنە دەرەوە. پێیان دەڵێم وابزانن ژنەکەیان ئامادە بووە پاشان پێیان دەڵێم هەریەکە و قسەیەك دەبارەی ژنەکەی بکات.

"دارلا. چەن رێك و پێك بویت."

هەموو ژنانی ئامادەبوی سیمینارەکە ئاخ هەڵدەکێشن.

"دارلا، جوان دەردەکەویت."

هەموو ژنانی ئامادەبوی سیمینارەکە ئاخ هەڵدەکێشن.

دواجار سییەم دەڵێت: "دارلا، چەن خۆشەویست بویت."

جارێکیتر هەموو ژنانی سیمینارەکە بەهەڵکێشانی ئاهێك هان دەدەن.

بەڕێزان بزانن وشەکانان کەلێك کاریگەریی هەیە.

**چەن پێشنیارێك**

وایدابنێ چویت بۆ میانداریيەك ئیستا کاتی رۆشتنە. بەخاوەنماڵ مەڵێ: "جوان بوو." ئەمە هەموان دەیڵێن. بڵێ: "بەشکۆ بوو، بێ وێنە بوو، نایاب بوو." پاشان بەخاوەنماڵ بڵێ بیرەوەرییەکی زۆر خۆشت لەومیوانیەدا بۆ دەمێنێتەوە، بڵێ: "کاتێکی بێ وێنەت بەسەر برد، گەلێك بەشکۆ بوو." ڕەنگە

هەندێجار بەرکاربردنی ئەم وشانە لەسەرەتاوە ئاسان نەبێت. بەلام بەشێنەیی عادەتی پێوە دەگریت.

### ☆ تەکنیکی ژمارە 26

**گەنجینەی واژەی تایبەتی تۆ**

**ئەو چەن وشەیەی ڕۆژانە بەکاری دێنیت سەرنجیان بدە.**

**پاشان چەن وشەیەکی نوێ بەکار بێنە بزانە چ هەستێکت پێدەبەخشێت. ئەگەر ئەو واژانەت خۆشدەوێ بەردەوام بەکاریان بێنە.**

**بزانە تەنانەت ٥٠ وشە دەتوانن جیاوازی بەرچاوی بەدی بێنن.**

**لەماوەی دوو مانگی داهاتوو هەر ڕۆژێک یەک وشە بەکار بێنەو کاریگەرییەکەی ببینە.**

## ٢٧

## چۆن بەکەسێکی جەنجاڵ دەرنەکەوین
## (یاهاوشێوەی تۆ دەرکەوێت)

پڵنگ لەگەڵ پڵنگ، شێر لەگەڵ شێر. بازو هەڵۆ لەگەڵ هاوتای خۆیاندا دەبن. هاوشێوە بوون نایابی بەدی دێنێت. بەڵام لەجەنگەڵی مرۆیی پشیلەی گەورە نهێنیەك نازانێت. کاتێ تۆ هاوشێوەی خۆت ئاشکرا نەکەیت یان بوار نەدەیت کەسانیتر بیدۆزنەوە. گرفتی زیاتر دێتە ئاراوە لەمەش گرنگتر بۆ ئەوەی بکەیت بەپەیوەندیەکی کاریگەر ناتەوێ لەبەرامبەر کەسانیتر جەنجاڵ بیت.

هەرکاتێ کەسێك ئامازەی بەخولیایەکی هاوبەش کرد، لەجیاتی ئەوەی خۆت هەڵدەیتە نێو قسەکەی‌و بڵێیت: "منیش هەروەها، منیش هەمان کار دەکەم." یان " ئەو مەسەلەیە بەچاکی دەزانم." لێگەڕێ دوێنەری تۆ لەقسەکردن دەربارەی ئەو شتە چێژ ببینێت. مۆڵەت بدە پێش ئەوەی بڵێیت تۆش ئەندامی هەمان یانەیت ئەو لەبارەیەوە بدوێت.

چەن ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ کەسێك تازە دەمناسی وتم چەندە حەزم لەیاری ئەسکێتە. بەدیقەتەوە گوێی لەقسەکانم گرت. باسم کرد لەچ ناوچەیەك ئەسکێت دەکەم. بارو دۆخی جیاوازم بۆ شیکار کرد، دەبارەی بەفری دەسکرد قسەم کردو بەراوردم کرد بەبەفری سروشتی، لەهەموو بارەیەکەوە دووام‌و

پاشان بیرم کردەوە لەئاشنا تازەکەم بپرسم ئایا ئەویش حەزی لەئەسکێتە.
ئەو وتی: "بەڵێ، من ئاپارتمانێکی بچوکم لەئاسپین هەیە."
چەن سەیرە، ئەگەر ئەو لەدەسپێکی ئەو قسەیەی من دەربارەی ئەسکێت کردم خۆی هەڵدایەتە نێو قسەکانمەوە بیوتبایە ئەویش حەزی لەئەسکێتە، منی دەخستە ژێر کاریگەرییەکی بەتینەوە. بەڵام کاتێ تاکۆتایی گوێی بۆ قسەکانم گرت‌و پاشان وتی لەئاسپین خانویەکی هەیە، باسەکە بۆ هەمیشە لەمێشکمدا مایەوە.
لێرەدا دەگەینە تەکنیکێك ناووم لێناوە "منیش هەروەها". کاتێ کەسەکان دەربارەی خولیاکانی خۆیان دەدەوێن لێگەڕێ بابیرو بۆچونی خۆیان دەربڕن. دوایی کاتێکی گونجاوت دەسکەوت ئەو کاتە بڵێ تۆش حەز لەو شتە دەکەیت.

وابزانم حەوسەڵەتانم بردووە:

چەن هەفتەیەك خۆم ڕاگرت تاکو ئەم پرسەم تاقی کردەوە. دواجار ئەم ئەرکە لەکۆنگرەیەکدا فەراهەم بوو. کەسێ تازە ئاشنام بوو دەبارەی نوێترین گەشت بۆ واشینگتۆن دی سی دەدوا. ئەو نەیدەزانی من لەو شارەدا گەورە بووم. دەربارەی دیدەنی‌و شوێنی جۆراو جۆری شار قسەی بۆ دەکردم. لێم پرسی لەکوێ نشتەجی بوو. لەکوێ خواردنی خوارد؟ ئایا توانی بچێت بۆ ئاواییەکانی مریلندو ڤێرجینیا؟ پاشان کەزانی بەدیقەتەوە گوێم بۆ قسەکانی ئەو گرتووە وتی: "لەوە دەچێت زۆر حەز بکەیت دەربارەی واشینگتۆن شت بزانی." "بەڵێ، بەلام من لەو شاردا گەورە بووم‌و ساڵانێکی لێی دوورم. "بەسەر سامیەوە پرسی: "خەڵکی واشینگتۆنیت؟ چۆن پێت نەووتم. دیارە حەوسەڵەی تۆم برد." من ڕاستگۆیانە وتم: "نا، هەرگیز. لەبیستنی

قسەکانت چێژم بینی. وتم ئەگەر ئەمەت پێ بڵێم دەست لەقسەکردن دەکێشیتەوە."

کاتێ کەسێك دەربارەی چالاکیەکی خۆی قسەت بۆ دەکات، زمانت بگرەو وشەیەك مەدرکێنە. لێگەڕێ باقسەکانی خۆی بکات. ئارام بگرەو چێژ لەقسەکانی ببینە. دوایی لکاتێکی گونجاودا وێکچونی کارەکەی خۆتی پێ بڵێ و پاشان بڵێ زۆر تامەزرۆی دەربارەی قسەکانی ئەو زانیاری زیاترت هەبێت.

☆ تەکنیکی ژمارە ٢٧

**لەوتنی "منیش هەمانشێوە" دورە پەرێزبە**

هەرکاتێ خاڵێکی هاوبەشت لەگەڵ کەسێکدا هەبوو. هەرچەن درەنگتر ئاماژەی پێ بکەیت. ئەو زیاتر دەخەیتە ژێر کاریگەرییەوە. بەڵام لەڕادەبەدەر لەوتنی ئەم خەسڵەتە هاوبەشە خۆت دوامەخە ئەوەك فریوت بدەن.

## ٢٨

## چۆن ڕێزو خۆشەویستی ئەوان بگریت

هیچ وشەیەکی دوو پیتی لە"تۆ" گرنگتر نییە.

چۆن ئەم وشەیە تائەم ئاستە بەهێزە؟ کاتێ منداڵ بووین وامانده‌زانی تەنها هەرخۆمان تاکە بونەرین، لەو سەردەمەدا شتێك بێجگە لە"من"، "بەمن" و "خۆم" گرنگتر نەبوو. لەسەرنجدانی کەسانیتر تەنها بیرمان لەم پرسە دەکردەوە ئەوان چی بۆ ئێمە دەکەن. لەو سەردەمەدا لەترۆپکی خۆ ویستیدا ئەم خاڵەمان بەلاوە گرنگ بوو کەسانیتر چی بۆ ئێمە دەکەن.

کەسانی سەرکەوتوو دەزانن هیچ گۆڕانێکمان بەسەردا نەهاتووە. کەسانی گەورەو بەساڵاچوان خۆ ویستنی خۆیان لەژێر سایەی شارستانیو بەئەدەبیدا نیشان دەدەن. بەلام زەینی ئەوان دەسبەجێ دەگاتە ئەم پرسیارە: "چ سوودێت بۆ من هەیە؟" وابزانە هاوڕێکەت جیل، بۆ ئێوارە خوانێك بانگ دەکەیت. پێی دەڵێیت: "ڕیستورانێکی هیندی خۆش کراوەتەوە ئایا حەز دەکەیت پێکەوە نانێك بخۆین؟" جیل، بەرلەوەی وەلام بداتەوە بیرێك دەکاتەوە: "مەبەستی لەوشەی خۆش چییە؟ ئایا ئامارە بێت بۆ جۆری خواردنەکە یان جۆری فەزای ڕیستۆرانەکە یان هەردوکیان؟" پاشان دێت بەخەیاڵیدا ئەو هێندە حەزی لەخواردنی هیندی نییە. هەڵوەستەیەك دەکات. بەلام تۆ لەم هەڵوەستەکردنەی ئەو تێدەگەیت حەزی لەوە نییە نان لەگەڵ تۆدا بخوات.

ئێستا وایدابنێ لەجیاتی ڕستەی پێشوو پێی دەڵێیت: "جیل، یەك ڕستۆرانی تازەی هیندی کراوەتەوە کەدڵنیام "تۆ" زۆرت حەز لێیە. پێتخۆشە پێکەوە لەوێ نانێك بخۆین؟" بەمجۆرە پرسیارە ئەگەری ئەوەی جیل، وەڵامی ئەرێت بداتەوە بەرەو باڵا دەبەیت. بنەمای چێژ –ئازار، هێزی ڕێنمایی ژیانی ئێمەیە. دەروونناسان لەوباوەڕەدان کەهەموو خۆ بەخۆ بەرەو چالاکیەکەك کێش دەبن کەچێژ بەخش بێت. هەموو خەڵکی خۆ بەخۆ ئەو کارەی بەلایانەوە شایانی سەرنج نەبێتو ئازاریان بدات دووردەکەونەوە. بۆیە کەسانی سەرکەوتوو لەبواری جۆراو جۆر بیر لەم بنەچەیە دەکەنەوە، بەم پاساوەشە ناوی ئەم تەکنیکەم ناوە "پەیوەندی".

**کاتێ چاوەڕوانی چاکە لەکەسێك دەکەیت. پەیوەندی ببەستە**

کاتێ لەپەیوەندی کەسانیتردا، تۆ یان ئێوە. سەرەتا دەسپێشخەر دەبیت زیاتر لەکۆمەكو چاکەی ئەو بەهرەمەند دەبیت. وایدابنێ دەتەوێ چەن ڕۆژێك مۆڵەت وەربگریت. دوو ڕۆژی کۆتایی هەفتەت هەیە دەتەوێ ڕۆژی سێیەمی بۆ زیاد بکەیت. بڕیار دەدەیت لەسەرۆکەکەت بپرسیت ئایا دەتوانی چوارشەممە نەیەیتەوە؟ بەبڕوای تۆ ئەو بەکام ڕستەی داخوازی تۆ کاردانەوەی زیاتر دەبێت. "جەنابی سەرۆك، ئایا دەتوانم ڕۆژی چوار شەممە نەیەمەوە؟" یان "جەنابی سەرۆك، ئایا دەتوانیت ڕۆژی چوارشەممە مۆڵەتم بدەیت؟"

لەڕستەی یەکەمدا سەرۆك بیر لەوە دەکاتەوە کە: "ئایا دەتوانم بەبێ ئەو ڕۆژی چوارشەممە تێپەڕێنم؟" ئەمە ڕەهەندێکی بیکردنەوەی زیاتر دێنێتە ئاراوە.

بەڵام لەڕستەی دووەم. تۆ لەجیاتی سەرۆك بیر دەکەیتەوە لەم دۆخەدا گریمانەی بەهێزە ئەو بگاتە ئەم ئاکامەی دەتوانێ ڕۆژی چوار شەممە بەبێ تۆ تێپەڕێنێت.

## ستایش و پیامەلگوتنی خۆت گرێبدەرەوە

پەیوەندی دۆخی کۆمەلایەتی تۆ باشتر دەکات. ڕەنگە کەسێك بیەوێ ستایشی جلەکانت بکات، کام ڕستەی ستایشی ئەووت بەدڵە؟ "من ئەم جلەی تۆم زۆر پێ جوانە." یان "ئەم جلانە لەتۆ دێت، زۆر لێت جوانە."

کەسانی سەرکەتوو کەسانێکن خاوەنی کارامەیی پەیوەندی بتەوون. وابزانە لەشوێنێك لێدوانێك دەدەیت و یەکێ لەئامادەبوان پرسیارێکت لێدەکات. کام ڕستەیەی پێ باشە لەتۆی ببیستێت؟ "پرسیارێکی جوانە" یان "تۆ پرسیارێکی زۆر جوانت کرد." سەرکەوتوەکان کەسانێکن کەکەسەکان بەتۆو ئێوە دەدەوێنن، لەجیاتی ئەوەی لەکۆتا وتەیاندا بڵێن: "دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە..." دەڵێن: "ئێوە دەگەنە ئەم ئەنجامەی کە..."

کاتێ لەگەڵ کەسانی نەناسراو لەشەقامێکدا قسە دەکەیت سوود لەوشەی "ئێوە" ببینە. جارێکیان لەسانفرانسیسکۆ کوڕەکەم لێ وونبوو. پرسیارم لەخەڵکی دەکرد تاکو ناونیشانی"پول گولدن گیت" بدۆزمەوە. لەنێویاندا لەژن و مێردێکم پرسی: "نازانم پول گولدن گیت بدۆزمەوە." ژن و مێردەکە سەیرێکی یەکترییان کردو پاشان پیاوەکە ئاماژەی بۆ ڕێگەیەك کرد وتی: "ئا، لەوێوە برۆ." من کەهێشتا ڕێگەکەم نەدۆزیبویەوە، لەکەسێکی دیکەم پرسی: "ببورە، پول گولدن گیت لەکوێوەیە؟" بێئەوەی بزەیەك بکات ڕێگەیەکی دیکەی نیشاندام. پاشان گەشتمە ئم ئاکامەی بەڕەوشێکی دیکە پرسیار بکەم. کاتێ تووشی ژن و مێردێکی دیکە بووم سەرم لەجامی ئۆتۆمبێلەکەوە بردە دەرەوە پرسیم: " بمبورن. ئایا ئێوە دەزانن پول گولدن گیت لەکوێوەیە؟" ئەوان وەلامیان دایەوە: "بێگومان." ئەم پرسیارەی من کاریگەری لەسەر غروری ئەوان هەبوو. تێگەشتم وشەی " ئێوە" تا چ ڕادەیەك کاریگەرە.

*کاتێ کەسانیتر بەتۆ یان ئێوە دەدوێنیت، بەهەژینێکی زیاترەوە وەڵامت دەدەنەوە.*

### ☆ تەکنیکی ژمارە ٢٨

**پەیوەندی دروست**

**ڕستەی گونجاوی خۆت بەوشەی ئێوە یان تۆ دەست پێبکە. بەمجۆرە دەستبەجێ سەرنجی کەسی بەرامبەر بۆ خۆت کێش دەکەیت. جۆرێک بدوێ لەسەر غروری ئەوان کاریگەری ئەرێنی بەجێ بێڵیت. بەمجۆرەش باشتر دەگەیتە ئەنجام.**

**بەکارهێنانی وشەی ئێوە نیشانەی ژیرییە**

دەروونناسان گەشتونەتە ئەم ئاکامەی ئەوانەی نەخۆشی دەروونیان هەیەو لەناسایشگاکانی دەروونیدان بەبەراورد لەگەڵ کەسانی ئاسایی کەلە دنیادا دەژین وشەی من ١٢ جار زیاتر دوبارە دەبنەوە. هەرچەن حاڵی ئەم نەخۆشانە باشتر بێت کەمتر وشەی منو زیاتر وشەی ئێوە بەکاردێنن.

هەرچەن کەمتر ڕاناوی من بەکار بێنیت. زیاتر نیشانی دەدەیت خاوەنی ژیرییەکی ساغیت. سەرکەوتوەکان زیاتر ڕاناوی ئێوە بەکار دێنن.

## ٢٩

### چی بكەین بزانن تۆ بزە بۆ هەموو كەسێك ناكەیت

ڕۆژێـك لـەو كەشـتیەی كـارم تێـدا دەكـرد لەتەنیشـت كەشـتیوانەكەو هاوسـەرەكەیو ژمارەیـەك لەئەفسـەران وەسـتابووم. یـەكێ لەكەشـتیاران كەبزەیەك بەڕوخسارییەوە بوو دەستیكرد بەتەوقە كردنو كەگەیشتە مـن هێنـدە خەندەكەی گەش بوو ددانە سپییەكانی دەركەوتن. هیوای گەشتێكی خۆشـم بـۆ خواست هات بەخەیاڵمدا دوایی لەگەڵ ئەم پیاوە ڕووگەشەدا قسە بكەم.
بۆ كەسانی دواتریش هەر بزەی لەسەر لێو بـوو. ئـەو تـاكو دوایـن كـەس هـەروا ڕوی گەش بـوو. كەگەشـتە دوایـن ڕیـز، هەسـتم كـرد حـەزم لەقسـەكردن نییـە لەگەڵ ئەودا.

چۆن ئەمە ڕوویدا؟ لەبەرئەوەی بزەكەی ئەو، هەرچـەن گـەشو جـوان بـوو، هـیچ كاردانەوەیەكی بەدی نەهێنا. چـونكە بـۆ هـەمووی بەیـەك شـێوە بـزەی دەكـرد بەمجۆرەش جیـاوازی خـۆی لەدەسـتدا. ئەگـەر ئـەم پیـاوە بەهـەر یـەك لەئێمـە شێوەیەكی كەمێك جیاوازی لەبزەكردنەكەیدا هەبوایە جیاواز دەبوو.

**بزەکانی خۆت شیکار بکە**

ئەگەر پیشەکەت وایدەخواست چەکێك لەگەڵ خۆت هەلگریت، دەربارەی بەشە جیاوازەکانی ئەم چەکە توێکاری تەواو بکە. بەرلە نیشانە شکاندن بیر لەوە دەکەیتەوە ئامانجەکە دەپێکیت یان بریندار دەکەیت. بۆیە بزەکانی گرنگترینو بەهێزترین چەکی پەیوەندی تۆیە، لەکاریگەری لەسەر ئامانج یان کەسەکان وریابە. لەبەر ئاوێنەدا بۆستە بزە بۆ خۆت بکە لەجیاوازییە جوانەکانی بزەکردن لەخۆتدا دیقەت بدە.

کاتێ سڵاو لەکەسێك دەکەیت، هەواڵی دەپرسیت یان پێی دەڵێیت لەبینینی خۆشحاڵیت. بزەکانی خۆت بگۆڕە. یەك زەردەخەنە لەهەموو شوێنێك بەکار مەهێنە.

☆ **تەنکنیکی ژمارە ٢٩**

**بزەی پاوانکاریی**

ئەگەر بۆ هەموو کەسێك بەیەك شێوە بزە بکەیت. ئەوا بزەی تۆ کاریگەری خۆی لەدەست دەدات. کاتێ چاووت بەکەسانی جیاواز دەکەوێ بۆ هەرکامێکیان بزەیەکی جیاواز بنێرە.

ئەگەر کەسێك لەکۆمەڵێکدا بەلاتەوە گرنگترە. ئەوا خەندەیەکی بەرینتری بۆ بنێرە.

## ٣٠

### وەك قۆشمەچییەك خۆت دەرمەخە

لەکاتی ئاخاوتن لەگەڵ کەسانیتر ئاگات لەقسەکردنی خۆت بێت. بزانە کاتێ لەگەڵ کەسانیتردا دەدوێیت ئەوان لەسەر ئەو قسانەی تۆ چڕ دەبنەوەو حسابێکی تایبەتت بۆ دەکەنەوە دەربارەی تۆ دادڤانی دەکەن.براوەکان خۆیان بەمەزن دەزانن زۆرێك لەدەوروبەری خۆیان بەگێل و گەمژە دەزانن.

ئایا براوەکان خۆیان بەوشەی نەگونجاو دەناسێنن؟ نا، لەسەردەمی ئەمڕۆدا کاتێ تۆ قسەی کلێشەیی دەکەیت، لەڕاستیدا دەڵێیت وێناو خەیاڵی خۆم لەدەستداوە. وشەی نوێ نایەت بەخەیاڵمدا. کردنی قسەی کلێشەیی کەسێکی ئاسایت لێ دروست دەکات.

**تەکنیکی ژمارە ٣٠**

**کلێشەیی قسە مەکە**

وریابە لەگەڵ براوە گەورەکاندا کلێشەیی قسە مەکە. ئەگەر بەمجۆرە بدوێیت. وەك گێل و گەمژەیەك دەردەکەویت. لەجیاتی ئەوەی کلێشەیی بدوێیت، بۆ باشتر ئاخاوتن لەتەکنیکەکانی دواتر سوود ببینە.

## ☆ ٣١

## چۆن لەڕەوشی وتەبێژە ئیلهام بەخشەکان
## بۆ دەسکەوتنی وشەی باشتر سوود ببینیت

دەڵێن قەڵەم لەشمشێر بڕندەترە. بەڵێ، هەروایە لەئێمەشدا زمان لەقەڵەم بڕەندەترە. زمان دەتوانێت کۆمەڵێك بخاتە پێکەنین یان فرمێسك بەچاواندا بێنێتە خوارەوە. وتەبێژان دەتوانن بەقسەکانیان میللەتێك بیەنە مەیدانی جەنگەوە. ئەوان چ کەرەسەیەکیان پێیە؟ سەهەمان چاو، گوێ، دەست، قاچ، زمان‌و ئەو شتانەی تیکەی من‌و تۆ هەمانە.

ڕەنگە وەرزشکارێك لەشێکی بەهێزتری هەبێت یان ئاوازخوێنێك دەنگێکی خۆشتری هەبێت. بەڵام وتاربێژێك هەمان ئەو شتانەی هەیە کەمن‌و تۆش هەمانە. بەم جیاوازییە ئەو زیاتر لەم شتانە بەهرەمەندە.

ئەوان لەدەستەکانیان. لەشیان‌و حاڵەتەکان بەهرەیەك وەردەگرن کاریگەری لەسەر خەڵکی هەبێت. ئەوان ئاگایان لەو کەش‌و فەزلیەیە کەتێیدا دەدوێن. ئەوان بەهرە لەدەنگ‌و ڕیتمێك وەردەگرن.

خێرایی قسەکردنیان کەم زیاد دەکەن‌و تەنانەت لەبێدەنگیش بەهرە وەردەگرن.

ڕەنگە ناچار نەبیت لئایندەیەکی نزیکدا وتەبێژیی یان لێدوانێك بدەیت، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە ڕۆژێك (ڕەنگە بەم زووانە) بتەوێ کارێك بکەیت کەسانێ

پەیرەوی لەتۆ بکەن. بۆئەوەی دۆخێکی باشترت هەبێت یەك دوو کتێب دەربارەی وتەبێژی بکرەو بیخوێنەوە.

بۆ خۆ دەوڵەمەندکردن لەوشەدا کتێبی جۆراو جۆر بخوێنەوە هەوڵبدە ریکچونەکانت لەگەڵ ئەو پێگەیەی خۆتدا هاوتا بێت. بەهەر کەسێك لەهەر پێگەیەکدا بێت بەشێوەی گونجاو بدوێ.

ئەوان بخەرە پێکەنین، پێکەنین، پێکەنین:

کەسانی قسەخۆش گفتوگۆ دەوڵەمەند دەکەن. بزانە نوکتەو قسەی خۆش دەبێت گونجاوو گونجاوتر لەگەڵ بارودۆخدا بێت. ئەگەر لەبەرنامەی جیاوازدا بەشداری دەکەیت لەهەرکامێك بەدیقەتدانەوە لەکەش و فەزای ئەو شوێنە سوود ببینە.لەمیانە کۆڕێکی ئابوریدا بیستم یەکێ لەپلەباڵاکانی کۆمپانیایەك وتی: "باری ئابوریمان باشە. دەتوانین ساڵانێك بەمجۆرە بەردەوام بین، مەگەر بمانەوێ داوای داواکاران جێبەجێ بکەین." بەم قسەیە ئەو گوشارەی رەواندەوەو فەزایەکی ئاسانتر باڵی بەسەر دانیشتنەکەدا کێشا.

زۆرێك لەئەکتەرە گەورەکان دەیانەوێ کۆبەندی قسەکانیان بەگوێ و چاوی خەڵکی بگەێنن. ماوەیەکی زۆر بەبێداری لەپێخەفی نوستندا دەمێننەوە بیرلەوە دەکەنەوە دەتوانن چ قسەیەك بکەن تاکو بەلای بینەر یان بیسەرانەوە خۆش بێت.

مارك ڤیکتۆر هنس، لەگەڵ جیك کانفیلد کتێبی "سوپی مریشك بۆ دەورن" یان پێکەوە نوسی سەرەتا ویستیان ناوی بنێن ١٠١ چیرۆکی جوان، بەڵام دواتر رایان گۆڕی کتێبی سوپی مریشك بۆ دەرون، سوپی مریشك بۆ ژنان، سوپی مریشك بۆ نەوجەوانان بلاو کردەوە. ئەم کتێبە فرۆشێکی زۆری هەبوو.

**خاڵێکی پێش بینی:**

بزانە بابەتەکەت هەر ئەندازیەك نایاب بێت، ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبێت کۆمەکت ناکات. ئەو ڕۆژانەی لەسەر کەشتیەکی گەشتوگوزار ژیانم دەکرد ئەم بابەتە بەباشیی فێر بووم. جارێکیان بەکەشتی دەچووین بۆ بەریتانیا من کتێبەکانی ئەلیزابیس بارتو ڕۆبیرت براونم دابە گەشتیارەکان بەناوی "چۆن خۆشم بوێیت؟" کاریگەری تەواوی لەسەر خوێنەران بەجێ هێشت تاچەن ڕۆژێك لەبارەیەوە دەدوان هەرکامێکیانم پێ دەگەشت لێی دەپرسیم: "چۆن خۆشم بوێیت؟"

**تەکنیکی ژمارە ٣١**

**لەقسەی خۆش‌و نوکتە سوود ببینە**

لەبەردەم کۆمەڵێکی زۆردا وەستابیت یان لەودیوی وەجاخەوە کەباب بۆ خێزانەکەت دروست بکەیت. دەتوانیت دوێنەرەکانت بەرەچاوکردنی کارامەیی تایبەت سەرگەرم بکەیت.

بابەتی وتاربێژەکان بخوێنەوە. وشەی ئەستەق بەکار بێنە. لەشوێنی تایبەت سوود لە نوکتە ببینە. هەوڵ بدە قسەکانت بەتام بن، لەمانەش گرنگتر هەوڵ بدە نوکتەزان بیت.

## ٣٢

## چۆن گاڵتە بکەین

ئەگەر بچیتە ئاسانسوارێکەوە هەموو ئەو کەسانەی لەناویدان بەزمانێکی مەجەڕستانی بدوێن. ڕەنگە ئاگات لێنەبێت ئەوان بیانین مەگەر ئەوەی زمانی ئەوان بزانیت بەڵام هەرکە دەم دەکەیتەوە ئەوان تێدەگەن تۆ مەجەڕستانی نیت.

لەبارەی کەسانی گەورەو ناودارەوە ئەم بابەتە پشتڕاست دەکرێتەوە. ئەگەر ژمارەیەك لەوان پێکەوە قسە بکەن‌و تۆش گوێت لێیان بێت لەوانەیە نەزانیت ئەوان بەناو بانگن بەڵام کەتۆ دەم دەکەیتەوەو قسە دەکەیت ئەوان تێدەگەن تۆ کەسێکی ناودار نیت مەگەر بەزمانی گاڵتەوە قسەیان بۆ بکەیت.

ع جیاوازییەك لەنێوان کەسانی گەورەو کەسانی بچوکدا هەیە؟کەسانی مەزن لەوشەی ڕاستی ناترسن. بەڵام کەسانی بچوك لەم بوارەدا خۆیان پەنا دەدەن. کەسانی مەزن بەئاسانی گاڵتە دەکەن. بەڵام کەسانی بچوك هەوڵی ئەوە دەدەن لەبازنەی ئەدەب دەرنەچن. کەسانی مەزن قسەی خۆیان دەکەن.

> **تەکنیکی ژمارە ٣٢**
>
> **هەموو شتێك بەناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بڵێ.**
>
> لەپشتی وشە جوانەکانەوە خۆت حەشار مەدە. ڕێك‌و ڕاست بدوێ، کەسانی مەزن وشەی ڕاستەقینە بەکاردێنن. ئەوان فێری زمان بوون‌و پێی دەدوێن، بەچەن خولەکێك گوێگرتم لەقسەکان. ئەکتەرە مەزنەکان لەئەکتەرە بچوکەکان جیا دەکەیتەوە.

## ٣٣

## چۆن لەخراپترین نەریتی گفتوگۆیی دور بکەوینەوە

جارێك بەشداری میواندارییەکی نانخواردنی سەرۆکی ئاژانسی رێکلامەکانی کۆمپانیایەکم کرد. لویس و ژنەکەی لیلیان بەخوادنێکی خۆشەوە پێشوازییان لەمیوانەکان کرد. لەکاتێکدا لویس دەیویست پەرداخی خواردنەوەکەی لەمێزەکە هەلگرێت چەن دڵۆپێکی لێ تکایە سەر مێزەکە.

ژنێکی میوان وتی: "هەست دەکەم دەردو خەمێکت نەبێت." هەموو لەم قسەیەی ئەم ژنە سەرسام بوون. کەسێك لەنێو کۆمەڵەکەدا وتی: "هیچ کەسێك لێمە کەلێرە ئامادە بوین دەردو خەمێکمان نییە، کەسێك لەگەڵ لویس و لیلیاندا بێت هیچ خەم و دەردێکی نابێت. ئێمە شەوێکی زۆر خۆش بەسەر دەبەین." هەموو خاترجەم بوون، کەسێك دەردو خەمی نەبوو بێجگە لە"باب" هاوسەری ئەو ژنە نەبێت. ئەو دەیزانی قسەی هاوسەرەکەی کاریگەرییەکی ناخۆشی کردووە،. لەزۆر کاتدا شۆخی کردن و سەرکردنە سەر دەکرێت بەشتێکی قورس بشکێتەوە.

---

### تەکنیکی ژمارە ٣٣

**شۆخی مەکە**

کەسانی بچوك لەوانەیە قسەیەك بەشۆخی و گاڵتەوە بکەن و بزەیەکی لاواز هۆکاری بێت. بەڵام کەسانی ژیرو مەزن ئەم کارە ناکەن. هەرگیزاو هەرگیز گاڵتە بەکەس مەکە، ناچار دەبیت بەهای گرانی بۆ بدەیت.

---

## ٣٤

## چۆن هەواڵێکی ناخۆش بدەین و
## هێشتا خۆشەویستیش بین

لەمیسری کۆنی فیرعەوکاندا کاتێ پەیام هێنەرێك دەهاتە کۆشکەوەو هەواڵێکی خۆشی بۆ دەهێنان، خۆشحاڵ دەبوون و ستایشیان دەکرد. بەڵام ئەگەر پەیام هێنەکە هەواڵێکی ناخۆشی بۆ فیرعەون بهێنایە بەفەرمانی فیرعەون لەملی دەدرا. نیشانەی ئەو ڕەفتارە لەئاخاوتنی ڕۆژانەدا بەدیار دەکەوێ. جارێك لەگەڵ هاوڕێیەکم ژمارەیەك قوتوی کەرەو بادام و مرەبامان کڕی و تاکو گەشتێك بەدەوری شاردا بکەین و لەوێ خواردن بخۆین. ئەو کاتەی بەسەبەتەیەك پیکنیکەوە لەفرۆشگا هاتینە دەرەوە، یەکێ لەهاوسێکان لەهەیوان دانیشتبوو سەیرێکی ئاسمانی کردو وتی:

"ڕۆژێکی خراپە بۆ چوونە سەیران. لەهەواڵەکانی کەشناسیدا نوسراوە لەچوونە دەرەوە بەدوربن." حەزمدەکرد هەرچیمان کڕێ بوو بیکێشم بەسەروچاویدا. نەك لەبەر هەواڵی کەش و هەوا، بەڵکو لەبەر ئەو بزەیەی لەسەر لێوەکانی بوو.

ماوەیەك لەمەوبەر پەلەم بوو سواری ئۆتۆبوس بم. بەپەلە خۆم گەیاندە بلیت فرۆشەکە تاکو بلیتێك بکڕم بەڵام ئەو پێی وتم: "پێنج خولەك دەبێت ئۆتۆتبوس وێستگەکەی بەجێ هێشتووە."

ئەوە هەواڵەکە نییە کەسەکە توڕە دەکات. بەڵکو ڕوخسارێکی بێزارکەرانەیە هۆکاری ناڕەحەتی دەبێت، هەموومان ناچارین جار جارێك هەواڵێکی ناخۆش بدەین بەڵام براوەکان بەتێڕوانینی دروستەوە ئەم کارە دەکەن.

پزیشـــکێك کەبەنەخۆشـــەکەی دەڵێـــت پێویســـتت بەنەشـــتەرگەریە بەمیهرەبانییـەوە قسـەکەی پێـدەڵێت. سـەرۆکێك کەدامەزراندنی کەسێك رەت دەکاتەوەو ناتوانێ دایمەزرێنێت. بەمیهرەبانییەوە پێی دەڵێت.

مەخابن زۆرێك لەخەڵکی ئاگایان لـەم رەوشـە هەسـتیارە نییـە. کاتێ بەهۆی فڕینێکی درێژخایەنەوە ماندوو دەبیتو کارمەندی هۆتێل ژوورێکی نەگونجاوت پێدەدات چی ڕوو دەدات؟ کاتێ لەڕیستۆرانێك داوای سوپێك دەکەیتو پێت دەڵێت نەماوە چی دەکەیت؟

---

**تەکنیکی ژمارە ٢٤**

**سەرنجێك لەوەرگر**

**یاریزانێکی تۆپی پێ ئەگەر پاسی خراپ بدات ناتوانێ لەمەیدانی پێشبڕکێدا زۆر بمێنێتەوە. ئەو کەسەی تۆپ دەنێرێت هەمیشە چاوی لەسەر ئەو کەسەیە کەوەریدەگرێت.**

**بەلەوەی هەواڵێك بگەیەنیت، وەرگری هەواڵەکەت لەبەرچاو بێت. گرنگ نییە چ هەواڵێك دەگەیەنیت. گرنگ ئەمەیە وەرگری هەواڵ چ لێکدانەوەیەکی هەیە.**

---

ئەگەر هاوسێکەم بەدڵسۆزیو پەیوەندی نزیك بونەوەوە بارینی بارانێکی بەتینم پێ بڵێت. لەو زانیارییەی پێم دەبەخشێت سوپاسی دەکەم. ئەگەر بەرپرسی فرۆشی بلیت بەمیهرەبانیەوە بڵێت ئۆتۆبوس وێستگەی بەجێ هێشتووە منیش پەسەندی دەکەم و دەڵێم چاوەڕوانی ئۆتۆبوسی دواترم.

براوە مەزنەکان دەزانن چۆن هەواڵێکی ناخۆش بگەیەننو چۆنیش هەواڵێك بەکەسانیتر نەدەن کەئەمەش مشتومڕی دواترمان پێك دێنێت.

## ٣٥

## چۆن وەڵام نەدەینەوە

باربارا، یەکێکە لەهاورێکانم لەکۆمپانیایەکی بەرهەم هێنانی پێویستیەکانی ماڵدا کار دەکات. ئەو لەم دواییانەدا لەهاوسەرەکەی فرانك جیا بویەوە. مێردەکەی هاوبەشی بازرگانی ئەوە. ئەم دوانە دوای جیابونەوەیەکی پڕ سەرو سەدا لێك جیابونەوە، بەڵام پێیان باش بوو بەردەوامی بەکاری هاوبەشییەکەیان بدەن بەمەش کاریان بەسەر یەکترییەوە نەبێت.
لەماوەیەکی کورتی دوای تەڵاقدا لەکۆنگرەیەکی پیشەسازی باباراداا بووم. ئەوو فرانك لەپیشەکەیاندا خۆشەویستیەکی زۆریان هەبوو، کارمەندان پێیان سەیر بوو چی ڕویداوەو چۆن ئەمە لەکارەکەیاندا ڕەنگی داوەتەوە بەڵام دیارە کەس نەیدەوێرا پرسیارێك لەم بارەیەوە بکات بارباراش ڕونی نەدەکردەوە.
کاتی نانخواردن لەگەڵ باربارا دانیشتبووم، یەکێ لەهاوکارەکانی ئەو لەگەڵمان دانیشتبوو نەیتوانی بزێوی خۆی جڵەو بکات بۆیە لێی پرسی: "باربارا لەنێوان تۆو فرانك چی ڕویداوە؟"
بابارا لەم پرسیارە سەرکەشانەیە کەمێ نارەحەت بوو وتی: "ئێمە لەیەکتر جیابوینەوە، بەڵام هاوبەشییەکەمان لەنێواندا لەکاردا هەر ماوەتەوە." ژنەکە لەم وەڵامە ڕازی نەبوو، پرسیارێکی دیکەی کرد: "ئایا هێشتا پێکەوە کار دەکەن؟"باربارا کەوچکێکی دیکەی هەڵگرت. قسەی پێشتری دوبارە کردەوە: "ئێمە لەیەکتر جیا بوینەوە، بەڵام کۆمپانیا لەشوێنی خۆی ماوەتەوە."بەڵام

ژنەکە بەئاسانی دەسبەردار نەدەبوو: "ئایا هێشتا هەردوکتان پێکەوە ک
دەکەن؟
" باربارا سەرنجێکی چاوی ئەو ژنەیدا بەبزەیەکەوە هەمان وەلامی پێشوی
دوبارە کردەوە: "ئێمە لەیەکتر جیابوینەوە بەڵام کۆمپانیا کاری خۆی مە
دەکات."ئەو وەڵامە ژنەکەی بێدەنگ کرد. باربارا سوودی لەهێڵ بەزێردا هێنار
بینی. ڕەوشی هێڵ بەزێردا هێنان، ڕەوشێکی بەکەڵکە کەبەهۆیەوە قسەو
پرسیاری ناخۆش ڕەت دەکەیتەوە.

**تەکنیکی ژمارە ٣٥**

**هەرکاتێ کەسێك بەپێداگرییەوە پرسیارێکت لێدەکات و حەز ناکەیت وەڵامی تەواوی بدەیتەوە. وەڵامی یەکەمجار دوبارە بکەرەوە. وەڵامی یەکەمجار بەڕیتمێکی یەکسان دوبارە بکەرەوە. کاتێ ئەوان وەڵامی دوباری ببیستن بەگریمانەیەکی زۆر بێدەنگ دەبن.**

## ٣٦

### چۆن لەگەڵ کەسی ناوداردا گفتوگۆ بکەین

وابزانە چەن خولەکێك پێشتر لەچێشتخانەیەکی باش لەسەر مێزێك دانیشتویت. سەیرێکی مێزەکەی تەنیشت دەکەیت چ کەسێك دەبینیت؟ ئایا بەڕاستی خۆیەتی؟ ئایا دەکرێت ئەمە ڕوو بدات؟ ڕێك لەو دەچێت...نا، خۆیەتی، وودی ئالن. (دەتوانیت لەجیاتی وودی ئالن هەر ناوێکی دیکە دابنێیت.) چی دەکەیت؟

کار بەتایبەتی مەکە. لێگەڕێ ئەو کەسە ناودارە کەمێك ئاسودە بێت. ئەگەر ئەو سەیری لای تۆی کرد. بزەیەك بکە بەنیشانەی ئەرێ سەرێك ڕاوەشێنە. پاشان نیگایەکی وەرگرە خەریکی کاری خۆتبە.

ئێستا ئەگەر ناتوانیت لەبەرامبەر کارەساتێك کەڕەنگە لەهەموو تەمەنتدا یەکجار ڕوو بدات بەرگری بکەیت دەتەوێ بەردەوام ستایشی خۆت بەگوێی ئەودا بدەیت. خۆت بگرە تاکو پێکەوە دەچنە دەرەوە. پاشان کاتێ پارە دەدەیت بێنەوەی کاتێکی زۆری بگریت بڵێ: "بەڕێز ئالن نازانیت چەندە لەدیتنی فیلمەکەت چێژم بینی. زۆر سوپاست دەکەم."ئایا سەرنجی خاڵێکی ئەم بابەتەت داوە؟ تۆ دادڤانیت دەربارەی فیلمەکەی ئەو نەکرد تاکو ئەو بڵێت: "تۆ کێیت تاکو دادڤانی ئەوە بکەیت من فیلمسازێکی باش بم یان خراپ؟" تۆ تەنها بەپێی تێڕوانینی خۆت دەتوانیت ڕای خۆت دەربڕیت.

هاوکات لێکەڕێ بازمانی جەستە ئەمە نیشان بدات لەوەیکە لەگەڵ کەسانی ناوداردا قسە دەکەیت خۆشحاڵیت.
ئەگەر وارێکەوت ئەو کەسە ناودارە هاوڕێیەکی لەگەڵ بوو، ئەگەر قسەی لەچەن خولەکێك زیاتری خایاند سەرنجی هاوڕێکەی بەلای قسەکانتدا کێش بکە. بزانە هاوڕێی کەسانی ناودار هەمیشە کەسانی زرنگو خاوەن سەرنجن.
فلیسیا، یەکێکە لەهاوڕێکانی منو کەسێکی مافناسە لەگەڵ یەکێك لەپێشکەشکارەکاندا هاوسەرگیریی کردووە. بەوەیکە "تام" لەتەلەفزیۆندا قسە دەکات بۆ هەرشوێنێك دەچێت خەڵکی دەیناسێت، کەمتر کەسێك گوی بەفلیسیا بدات. فلیسیا دەڵێت بۆ خۆیو تەنانەت بۆ "تام" شتێکی بێزارکەرە. هەر کاتێ دڕۆن بۆ میوانییەك خەڵکی لەدەوری تام کۆ دەبنەوە کەس گوێ بەفلیسیا نادات. ئەوو تام زۆر حەزیان لەوەیە شەوانە بچنە ڕیستۆرانەکانە بۆ نانخواردن بەلام ئێستا شەوانە لەماڵەوە دەمێننەوە.

## "من حەزم لەکارەکەی پێشوی تۆیە"

زۆرجار هونەرمەندانی سینەما بەسەرنجدان لەدوایین فیلمیان ستایش دەکرێن، سیاسەتمەداران لەبەر دوایین هەڵبژاردنیان ستایش دەکرێن. دوایین کتێبی نوسەرێك دەستاوێزێکە خەڵکی قسەو باسی لەسەر دەکات. بۆیە کاتێ لەگەڵ هونەرمەندان، سیاسەتمەدارانو کەسانی هاوشێوەی ئەوان دەدوێیت. هەوڵبدە ئاماژە بەکارەکانی کۆتایی ئەوان بکەیت، ئەگەر بەوودی ئالن بڵێیت حەزت لەو فیلمەی ساڵی ١٩٨٠ ی ئەوە، ئەوا قسەکەت هێندە جێگەی خۆی لەدڵی ئەودا ناکاتەوە، ڕەنگە ئەو بڵێت: "دەربارەی ئەو هەموو فیلمە نوێیانەم چی دەڵێت؟" تابۆت دەکرێت پرسیار دەربارەی دوایین کاری ئەوان بکە.

### ☆ تەکنیکی ژمارە ٣٦

**کەسانی ناودار**

**کاتێ لەگەڵ کەسانی ناوداردا دەدوێیت. باسی بەرهەمەکانیان مەکە. ئاماژە بەوە بکە چەندە چێژت لەکارەکانیان بردووە. ئەگەر ئاماژەت بەیەکێك لەبەرهەمەکانی کرد باهەمیشە دوایین کارو بەرهەمی بێت. ئەگەر کەسی مەبەست لەگەڵ ئەو بێت، هەوڵ بدە کێشی بکەیتە نێو ئاخاوتنەکەوە.**

٢٧

## چی بکەین سوپاس بکرێین

ئەوەی ماتەوە ئەمەیە بەڕەوشێکی سادە هەوڵ بدەین کەسانیتر لەبێتمان خۆشحاڵ ببن. دەبێت کارێك بکەین ئەوان کاری باشمان لەگەڵ بکەن، ستایشمان بکەن، ئاڵوگۆڕی بازرگانیمان لەگەڵ بکەن، یان خۆشیان بوێین. بابەتەکە زۆر گرنگو سادەیە. دەتوانیت بۆ هەموو کەسێك سوود لەم یاسایە وەرگریت، کاتێ کردت بەعادەتێك دەبینیت هەموو رۆژێك سوودی لێدەبینیت.

هەرگیز ووشەی سوپاس بەتاکو تەنیا دەرمەبڕە. ئایا خوازیاریت لەو موشتەرییەی کەکڕینێکی باشی لەتۆ کڕیوە بەیەك وشەی "سوپاس" سوپاسی بکەیت؟ ئایا دەخوازیت خۆشەویستێك خواردنێکی خۆشی بۆ ئامادە کردویت بەیەك دەربڕینی "سوپاس" سوپاسی بکەیت؟

هەمیشە "سوپاسکردن" هاوشانی پاساوێك بکە.

لەهاتنت سوپاست دەکەم.

لەوەی تاکو ئەم ئاستە تێگەشتویت سوپاست دەکەم.

لەوەی چاوەڕوان بویت سوپاست دەکەم.

لەوەی ئەم چاکەیەت لەگەڵ کردم سوپاست دەکەم.

زۆرجار کەلە فڕۆکە پیادە دەبیت فڕۆکەوانو میواندارەکە نزیکی دەرگای دەرەوە وەستاوون. لەبەر کارەکەیان سوپاسیان بکە. "سوپاستان دەکەم ئێمەتان بەسەلامەتی گەیاندە ئێرە." ئەم ڕەوشە کاریگەریی بەرچاویی هەیە

بەجۆرێك وەڵام دەدەنەوە: "تکا دەکەین، خۆشحاڵین ئێمەتان بۆ گەشتەکەتان هەڵبژارد."

### تەکنیکی ژمارە ٣٧

**تەنها واژەی سوپاس بەس نییە**

**هەرگیز"سوپاس" بەتاك و تەنیا دەمەبڕە. بەچەمکێکی دیکەوە بیبەستەرەوە: لەو پرسیارەی تۆ کردت سوپاست دەکەم.**

لەوەی ئەم بەشەی کتێبەکەت خوێندەوە سوپاست دەکەم، بائێستا بچینە سەر بەشێکی دیکەو دەمانەوێ بزانین چۆن بتوانین زانایانە لەگەڵ کەسانیتر بدوێین.

## بەشی چوار

## چۆن لەنێو کۆمەڵێکدا خۆمانەیەک بیت

### *دەربارەی چی گفتوگۆ بکەین*

ئایا تائێستا ڕویداوە لەکۆڕێکدا بیتو ئامادەبوان دەربارەی کۆمەڵێك شت بدوێنو تۆش کەمترین زانیاریت لەبارەیەوە نەبێت؟ ڕەنگە ئامادەبوان لەبوارە جیاوازەکاندا شارەزا بنو تۆ هیچ کامێك لەوانە نەبیت.

لەحاڵێکدا بزەیەکت لەسەر لێوانەو لەگۆشەیەك دەوەستیتو دەم ناکەیتەوە. دەترسیت ئەگەر قسە بکەیت شتێکی بێ مانا بڵێیت. بەدبینی شاڵاوت بۆ دێنێت. تۆ کەسێکی نامۆیت بۆیە لەگۆشەیەکەوە دەوەستیتو ئازار دەچێژیت.

کاتێ چوومە قۆناغی سەرەتایی هەمان بارو دۆخم هەبوو. بەتایبەت قوتابیە کوڕەکان تاکە بابەتێکیان پێ خۆش بوو ئۆتۆمبێل بوو من هیچ زانیارییەکم دەربارەی نەبوو.

ڕۆژێك دایکم دیارییەکی بۆ هێنام بارودۆخی گۆڕیم. چیتر شەرمم نەدەکرد. دایکم دەربارەی ئۆتۆمبێلی جۆراو جۆر کتێبێکی بۆ کڕیم منیش دەربارەی هەموویان زانیاریم بەدەست هێنا. کاتێ کەسێك دەربارەی ئۆتۆمبێل قسەی دەکرد دەمتوانی پرسیاری گونجاوی لێبکەم ئەمەش ژیانی کۆمەلایەتی منی گۆڕی.

ڕەنگە لەکۆڕی کەسانێکدا بیت هەرگیز لەقسەکانی ئەوان سەر دەرنەکەیت.
نیگەران مەبە، تاکە شتێك پێویستت پێی هەبێت زانینی چەند تەکنیکە.
تەنها کارێك دەبێت بیکەیت ئەمەیە دەبارەی باسەکە چەن پرسیارێك بکە. دیل کارنگی دەڵێت: "حەزی خۆت دەبڕە هەموو شتێك یەکلایی دەبێتەوە. دەبێت خاوەنی خولیایەکی زانایانە بیت. دەبێت بەجۆرێك دەرکەویت هەمووان بیانەوێ لەگەڵ تۆدا بدوێن.
لەم بەشەدا ئاشانای چەن ڕێکارێکتان دەکەم تاکو چوونە نێو هەر کۆمەڵێکەوە خۆتان بەنامۆ نەزانن.

## ٣٨

## چۆن ژن یان پیاوێکی ئەمڕۆ بین

هەرکاتێ دۆستو ئاشناکانم دێن بۆ نیویۆرك بۆ دیدەنی من، پێیان دەڵێم لەوێستگەی میترۆ بۆدۆزینەوەی ڕێگەی خۆت پرسیار لەکەس مەکەن. چونکە ئەوان تەنها شتێك بیزانن ئەمەیە لەکوێ سوار بوونو لەکوێ پیادە ببن، ئەمە بۆ زۆرێك لەبوارەکانی ژیانیش دەشێت. هەرکەس دەربارەی سەرگەرمیو خولیاکانی خۆی زانیاری هەیە. خودی خۆم چەن هاوڕێیەکم هەیە هەر یەکیەکان حەزی لەشتێکە. یەکێك حەزی لەیاری بۆلینگەو ئەویتر ئەسکێتبازەو دەتوانێ تاکو بەیانی لەبارەیەوە بدوێت. من ریتا (خولیای یاری بۆلینگ) و والتر (خولیای ئەسکێت لەسەر ئاو) بەیەکترم ناساندو خۆشی چێژی هەردولایانم زانی.

والتر وتی: "ئایا تۆ یاری بۆلینگ دەکەیت!"
ریتا بەبزەیەکەوە وتی: "بەڵێ، هەروایە." ریتا چاوەڕێ بوو کەوالتر لەم بوارەدا پرسیاری زیاتری لێ بکات. بەڵام والتر بێدەنگ بوبو.
ریتا بۆ ئەوەی بێدەنگیەکە بشکێنێت وتی: "لیل وتی تۆ یاری ئەسکێتی سەر ئاو دەکەیت." والتر بزەیەکی کردو چاوەڕێ بوو تاکو ریتا پرسیاری زیاتر بکات. "زۆر خۆشە، بەڵام مەترسیدا نییە؟" ئەمە زۆرترین قسەیەك بوو ریتا توانی بیکات.

"نا، هەرگیز مەترسیدار نییە." پاشان باسەکە لێرەدا گەشتە بنبەست.
لەبێدەنگیدا هات بەخەیاڵمدا ئەگەر ریتا یەکجار لەدەریادا یاری ئەسکێتی بکردبایەو والتریش جارێك یاری بۆلینگ. ئێستا دۆخەکە دەگۆڕا.

**ئایا غەوواسی دەزانیت؟**

من غەوواسی نازانم. بەڵام شەش ساڵ پێشتر لەبەرمۆدا تابلۆیەکم بینی نوسرابوو "غەوواسی بە٢٥ دۆلار، هیچ ئەزمونێکی پێشووت پێویست نییە." لەماوەی سێ کاتژمێر باشترین خولی فێرکاریی بەکڵاوی ئۆکسجینەوە فێر بووم. ئەمڕۆ هەرکەسێك دەربارەی غەوواسی پرسیارم لێبکات دەتوانم وەڵامی بدەمەوە.

**☆ تەکنیکی ژمارە ٣٨**

**گۆڕانێك لەژیاندا بکە**

**مانگی جارێك ژیانی خۆت بگۆڕە. وەرزشێکی نوێ هەڵبژێرە، برۆ بۆ نمایشگایەك، برۆ بۆ سیمینارێك تاکو دەربارەی ئەوەی شارەزاییت نییە زانیاری بەدەست بێنیت.**

## ٣٩

## چۆن ڕەفتار بکەیت تا بزانن تۆ دەربارەی پیشە یان سەرگەرمی ئەوان زانیاریت هەیە

شەوێکیان بەشداری میوانیەکم کرد کەژن و مێردێك سازیان کردبوو لەبەشی کۆمپیوتەر کاریان دەکرد. ئەوشەوەم زۆر ناخۆش بوو چونکە دڵنیا بووم تاکۆتایی لەهیچ قسەیەکی ئامادەبوان سەر دەرناکەم.
ئەو شەوە بڕیارمدا دەربارەی کۆمپیوتەر زانیاری بەدەست بێنم. ئەو کارەم کرد، ئێستا لەئاستێکدام دەتوانم لەبواری کۆمپیوتەر هەرپرسیارێکی هونەری بپرسم. تۆش لەهەرکۆڕو کۆمەڵێکدا بیت هێندە بەسە بتوانیت چەن پرسیارێك بکەیت تاکو لەگەڵ ئەوان خۆمانە بیت. پرسیاری کاریان لێدەکەیت و گوێ لەوەڵامەکانیان دەگریت دواتر یەك دوو پرسیاری دیکە دەکەیت.

**هەموو شتێك پەیوەستە بەپرسیاری سەرەتاوە**

یاریزانێکی تێنس لەیەکەم ساتەوە کەلە تۆپەکە دەدات دەتوانێ پەی بەئاستی یاریکردنەکەی تر بەرێت. بزانێ یاریکردن لەگەڵ تۆ خۆشە یان ماندوئامێزە. لەزەمینەی گفتوگۆو پەیوەندیدا هەمانشێوەیە. لەیەکەم پرسیاری سەرەتاوە کەسانیتر دەزانن ئایا قسەکردن لەگەڵ تۆ خۆشە یان بێزارکەرە.
بۆ نمونە، وایدابنێ من بەکەسێك دەناسێنرێم و یەکەم وشە لەدەمی ئەو دێتە دەرەوە ئەمەیە کە: "ئاه، تۆ نوسەرێکیت. کەی دەتەوێ ڕۆمانی گەورە

ئەمریکا بنوسیت؟" دەبینم لەگەڵ کەسێك دەدوێم هیچ شارەزایی لەدنیاکەی من نییە. هەڵبەت پێکەوە قسە دەکەین، بەڵام من هەوڵ دەدەم ئاراستەی ئاخاوتنەکە بگۆڕم لایەنی دوێنەرەکەم گەلێك زوو دەگاتە ئەنجامگیریی.

بەڵام ئەگەر کەسێك کەتازە یەکتر دەناسین بڵێت: "ئاه، تۆ نوسەریت، ئایا چیرۆك دەنوسیت یان کتێبی دیکە دەنوسیت؟" ئیتر تێدەگەم لەگەڵ کەسێك دەدوێم شارەزای دنیاکەی منە. چۆن؟ چونکە ئەمە پرسیارێکە هەموو نوسەران لەسەرەتاوە لەیەکتری دەکەن. من لەئاخاوتنم لەگەڵ ئەدا چێژ دەبینم چونکە دەزانم ئەو دەربارەی دنیای نوسین زانیاری هەیە. هەر پیشەیەك، هەر وەرزشێك، هەر حەزێك پرسیاری پیوەست بەخۆی هەیە کەهەموو ئەو کەسانەی لەو بازنەیەدا بن ئەوانە دەپرسن پزیشکێك لەپزیشکێکی دیکە دەپرسێت ئایا پزیشکی گشتی ددانیت یان لەبواری تایبەتیدا پسپۆڕیت؟" کردنی پرسیار لەسەرەتاوە ئاسانەو دەتوانی فێربیت پێویستی بەپسپۆڕی نییە، تەنها کردنی چەن پرسیارێکی دەسپێکردن تۆ دەخاتە ڕیزی خۆمانەکانەوە سەیر ئەمە کاتێ دوایی پێیان دەڵێیت لەپیشەو بواری ئەواندا چالاکیت نییە. زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە. بەخۆیان دەڵێن: "چەن کەسێکی شارەزایە!" "کۆمەك! هەموو ئەو کسانەی لەوێن هونەرمەندن" وایدابنێ بۆ فیستیڤاڵی گەلەرییەك بانگ هێشت کراویت دەزانیت لەم شوێنەدا هونەرمەندانی وێنەکێش ئامادە بوون. ئەگەر تۆ بەزمانێکی هونەرمەندا نەدوێیت، بزانە ئایا لەهاوڕێکانتدا یەك دوو هونەرمەند هەیە یان نا. دواجار کەسێك پەیدا دەکەیت، هاوڕێکەت "سالی" لەزانکۆی هونەر خوێندویەتی. زەنگی بۆ لێبدە پێی بڵێ، دەزانم ئەم قسەیەی من ڕەنگە گێلانە بێت بەڵام بانگ هێشت کراووم ناچارم لەگەڵ چەن هونەرمەندێك بدوێم کەلەوێ ئامادە دەبن، دەکرێت چەن پرسیارێکم پێ بڵێیت

تاکو لێیان بپرسمو پەیوەندییان پێوە بکەم؟ " بەلای "سالی"ەوە داوایەکی سەیرە، بەلام جۆری ڕوبەڕو بونەوەکەی تۆ کاریگەریی لەسەر ئەو دەبێت. ڕەنگە ئەو فێرت بکات بڵێیت: "لێیان بپرسە لەچ بوارێکدا وێنە دەکێشن؟" "بپرسم لەچ بوارێك؟" "بەڵێ، مەبەست ئەمەیە بەڕەنگو ڕۆن کاردەکەن، یان بەخەڵوز یان بەقەڵەم." "بەمشێوەیە؟"سالی، دەڵێت: "داوایان لێمەکە وەسفی کارەکەیان بکەنو ڕوونی بکەنەوە، بەلای ئەوانەوە وەسفکردنی وێنەکێشان شتێك نییە بتوانن باسی بکەن." "ئاه."لێیان مەپرسە ئایا کاریان لەگەلەرییەکەیدایە." "بەڕاست؟"

"لەجیانی ئەوە بپرسە شوێنێك هەیە بتوانم بەرهەمەکانتان ببینم؟" ئەم پرسیارەیان زۆر پێخۆش دەبێت چونکە ئەگەر نەتوانن گەلەرییەك دەسنیشان بکەن بانگت دەکەن بۆ ستۆدیۆی خۆیان تاکو کارەکانیان ببینیت.

**تەکنیکی ژمارە ٣٩**

**لەزمانی کاری ئەوان بەئاگابە.**

**براوە مەزنەکان دەتوانن دەبارەی کاری کەسانیتر بدوێن لەگەڵیاندا بەزمانی کاری خۆیان بدوێن. چۆن بەم زمانە بدوێیت؟**

**بۆئەوەی ببیتە یەکێك لەوان. چۆن فێری ئەم زمانە دەبیت؟**

**دەتوانیت بەئاسانی فێر بیت هێندە بەسە داوا لەیەکێ لەهاوڕێیانت بکەیت چەن پرسیارێکت لەبارەیەوە فێر بکات. پرسیاری کەمو کورتی تۆ بارتەقایەکی زیاتری دەبێت.**

ئەمە تەنها ئەو شتەیە بۆ پرسیارکردن پێویستت پێی دەبێت.

٤٠

## چۆن لەگەڵ پزیشکەکان گفتوگۆ بکەین

هاوڕێم جان، پزیشکە. لەگەڵ ژنێکی ژاپۆنی بەناوی یامیکاوە هاوسەگیریی کرد. جان دەڵێت یەکەمجار پێکەوە بانگ هێشتی میوانییەك کران زۆرێك لەهاوڕێکانی جان لەوێ بوو. یامیکا دەترسا. دەیویست کاریگەرییەکی باشی هەبێت، بۆیە قسەکردن لەگەڵ پزیشکان کارێکی دژوار بوو. جان تاکە پزیشك بوو چاوی پێی کەوتبوو لەو ماوەیەی هاوسەرگیرییان کردبوو دەربارەی پزیشکی شتی پەیوەست بەو بوارەوە زانیارییەکی ئەوتۆی پێنەبەخشی بوو.
جان وتی: "یام، خەمت نەبێت. ئەوان هەمان پرسیاری کۆن لەیەکتریی دەکەن. کاتێ چاووت پێیان دەکەوێ لێیان بپرسە تایبەتمەندی تۆ چییە، یان "لەنەخۆشخانەیەکی تایبەت کار دەکەیت؟"
"پاشان پرسیاری قووڵتر بکە. بۆ نمونە بڵێ ئەو نەخۆشخانەیەی کاری تێدا دەکەیت چ پەیوەندییەکت پێوەی هەیە؟ یان هەلو مەرجی پزیشکی لەسەر تۆ چ کاریگەرییەکی هەیە؟"
جان دەڵێت یامیکا بەگوێی ئامۆژگاری ئەوی کردو توانی لەبواری تایبەتی پزیشکانو پەیوەندی ئەوان بەنەخۆشخانەکانەوە پرسیاریان لێبکات.

**ڕشتەی وشە بەدەستەو گرتن**

تەنها پزیشکان نین. هەر پیشەیەك نیگەرانی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام کەسانیتر بەگرفتە ئاشنا نین. بۆ نمونە کتێب فرۆشە بچوکەکان گلەیی ئەوە دەکەن فرۆشگا گەورە زنجیرەییەکان بازاڕی ئەوانی قۆرخ کردووە. ژمێریاران نیگەرانی ئەوەن نەوەك لەژمێریاریدا هەڵەیەك بکەن و ڕوبەڕوی سزا ببنەوە. پزیشکانیش نیگەرانی کاری خۆیانن.

☆ **تەکنیکی ژمارە ٤٠**

**بەباسی گرنگ ئاشنابە**

بەرلەوەی کوێرانە بچیتە کۆڕێکەوە، پرس و جۆ بکەو بزانە باسی گرنگ و پەیوەست بەئامادەبوان لەکوێیە، هەر پیشەیەك گرفتی تایبەت بەخۆی هەیە ئەگەر ئاشنابیت پێیان بەاسانی دەتوانیت لەگەڵ ئەو دەستەو گروپە قسە بکەیت ببیتە کەسیکی خۆمانەی سەر بەوان.

٤١

## چۆن دەربارەی ژیانی ئەوان زانیاری بەدەست بێنین

گریمان ڕۆژنامەفرۆش، ڕۆژنامەکەی هێنـاوە بـۆ ماڵـەوە. فنجانێك قـاوە ئامادە دەکەیت تاکو ڕۆژنامەکە بخوێنیتەوەو بزانیت هەواڵی دنیا چییە. ئایا سـەرەتا دەچیتە سـەر هـەواڵی نێونەتـەوەیی؟ بەشـی وەرزشـی دەخوێنیتـەوە؟ ڕەنگـە بەشـی کۆمێدیو نوکتـەکان بخوێنیتـەوە؟ هـەر کامێـك ئـەمڕۆ دەچیتە سـەری سبەی ناچیتەوە. سبەی بچۆرە سەر بەشێکیتر. بەشـێك کـەمتر دەیخوێنیتـەوە. بۆچی؟ چونکە بەجۆرێك بـەدنیای جـۆراو جـۆر ڕوبـەڕو دەبیتـەوە بـەجۆرێك زۆر زوو لەگەڵ دۆخەکەدا دەبیـت لەگـەڵ کەسـەکان لەگروپـە جیاوازەکان ئاشـنایی پەیدا بکەیتو بتوانیت لەگەڵیان بەئاسانی بدوێیت.

دەربـارەی بەشـی مامەڵـەکانی موڵـك چـی دەڵێـت؟ ڕەنگـە ئـەم بەشـە هـەرگیز بەلاتەوە خۆش نەبێت. بەڵام لەوانەیە درەنگ یـان زوو بچیتە نێـو کەسـانێکەوە دەربـارەی موڵـك بـدوێیت. ئەگـەر هـەر چـەن هەفتەیـەك یـەکجار چـاوێکی پێـدا بگێڕیت زانیارییەك بەدەست دێنیت لەکاتی پێویستی سوودی لێوەردەگریت.

ستونی پەیامـە بازرگانیـەکان؟ ڕەنگـە وابزانیـت بـەبێ شـەقامی مانیسـۆن دنیا بەشوێنێکی گەلێك گرنگتر دەگۆڕێت. هێندە بەسە چاوێك بەم سـتونەدا بگێڕیـت تاکو ووشەی فراوانت دەسکەوێت.

ئەگـەر لەقسـەکانتدا ئـەو وشـانە بەکاربـەریت ئامـادەبوان لەکۆڕێکدا هـەواداری نەبن. ئەوا گرفت بۆ خۆت دروست دەکەیت.

ئەگـەر لەکەشـتیدا کەسـێك لێـت بپرسـێت مـاوەی چـەندی لـەم بەلەمـەدا کـار دەکـەیت نارەحـەت دەبیـت چـونکە تـۆ لەبەلەمـدا کـار ناکـەیت. لەکەشـتییەکی

گەورەی گەشتو گوزاردا کار دەکەیتو ئەمە بەلەم نییە. سوود وەرگرتن لەوشەی گونجاوو بەجێ شێوەی پەرجو بەگفتوگۆ دەبەخشێت. دەتوانیت بەپرسیاری بەجێو وتنی کردنی قسەی گونجاو لەگەڵ کەسانیتر پەیوەندی کاریگەرت هەبێت. بۆ گەیشتن بەم پێگەیە هێندە بەسە بەشە گرنگەکانی ڕۆژنامە بخوێنیتەوە.

ڕۆڵی گرنگی ڕۆژنامەی بازرگانی:

ڕۆژنامەو بڵاوکراوەی بازرگانی بخوێنەوە، ئەوانە گۆڤارێکن بۆ ئەندامانی هەر پیشەیەك دەبن. داوا لەهاوڕێیانو پیشەوەران بکە گۆڤارەکانتان پێبدەن.

چەن ساڵێك لەمەوبەر هەر هەفتەیەك یەکێ لەو گۆڤارانەم دەکڕی، کاتێ سودم لێ بینی یەکێ لەهاوکارەکانم بۆ ئێوارە خوانێك بانگهێشت کردم بۆماڵی خۆیان باخچەیەکی جوانی هەبوو من بەکۆمەکی گۆڤارو گوڵو باخچە توانیم دەربارەی گوڵو گیا لەگەڵ ئەودا قسەی نایاب بکەم.

بەسەرنجدان لەو زانیارییەی لەوبارەیەوە نیشانمدا، خاوەنماڵ داوای لێکردم باخچەکەی ببینم لەکاتی سەیرکردنی گوڵی باخچەکەدا توانیم مەسەلەکە بگەڕێنمەوە بۆ کاری کۆمپانیاکەمو لەگەڵ ئەودا لەمبارەیەوە قسە بکەم.

☆ تەکنیکی ژمارە ٤١

**گۆڤارە بازرگانیەکان بخوێنەوە**

**ئایا موشتەرییەکەت یاریزانێکی گۆڵفە، مەلەوان، یان ئەسکێت بازە؟ ئایا سەرۆکاریت لەگەڵ ژمێریاراندا هەیە؟ ژمارەیەکی زۆر بڵاوکراوە لەم بوارەدا هەیە بیانخوێنەوە سوودیان لێ ببینە.**

## ٤٢

## لەوڵاتانی دیکەدا چۆن قسە دەکەیت

گریمان بۆ کاری بازرگانی دەچیتە وڵاتێکی دەرەوە دەتەوێ لەگەڵ خەڵکی ئەوێ وەك خۆیان ڕەفتار بکەیت. یەکەم کارێك دەیکەیت کامەیە؟

یەکەم شت پاسپۆرتێك ئامادە دەکەیت کتێبێك دەربارەی زاراوەو دەربڕینەکان ئامادە دەکەیت. دروستە؟ بەهەرحاڵ چ کەسێك دەیەوێ وون بێتو دەسشۆرییەك نەدۆزێتەوە؟ یان لەکوالالامپور بەشەقامەکاندا بگەڕێتو نەتوانێ کۆلایەك بخواتەوە؟

یەکێ لەهاوڕێکانم بەناوی جرالدین کاری وتاربێژییە، دەربارەی یەکەم سیمیناری خۆی لەژاپۆن هاتبویە هەژین. ئەو لەفرۆکەکەدا چاکەتو پانتۆڵێکی لەبەر کردبوو چواردە کاتژمێرو ٦٧٣٧ میل دورتر چوار کەسی ژاپۆنی بەجلێکی شیكو فەرمی لەفرگەی ناریتا لەتۆکیۆ پێشوازییان لێکرد. پیاوە ژاپۆنیەکان لەکاتێکدا نیشانەی ڕێزیان دەنواند ئەو کارتێکی لەکیفەکەی دەرکرد بەسەرنجدان لەوەی ئەوان نەتوانن ناوی تەواوی ئەو بێنن "جرالدین" کورتکراوەی ناوەکەی خۆی "گری" لەسەر کارتەکە بۆ نوسین. پیاوە ژاپۆنیەکان جارێکیتر سەرێکی ڕێزیان بۆ نەوی کرد چەن جارێك ناویان هێناو دواجار یەکێکیان کارتەکەی کردە گیرفانی.

کاتێ هەر پێنج کەسەکە چوونە هۆتێلەوە دوایان لەگری کرد تاکو لەریستۆرانی هۆتێلەکە چا بخۆنەوە لەکاتی خواردنەوەی چادا ژاپۆنیەکان دیارییان

پێبەخشی، گری دیارییەکەی کردەوە وتی: "زۆر جوانە" پاشان وەک سوپاس کردن باوەشی بەهەریەکەیاندا کرد. لەم کاتەدا ژاپۆنیەکان حەزیان لەم رەفتارەی ئەو نەبوو. لەجێی خۆیان هەستان و رێزێکیان بۆ نواندو رۆشتن. گری بەدبەخت نەیدەزانی چی رویداو کوێی کارەکەی هەڵەی تێدا بوو.

هەموو کارەکەی ئەو هەڵە بوو. سەرەتا ئەو پانتۆڵە بوو کە لەپێی کردبوو. لەئاسیادا تۆ لەهەر دۆخێکدا بیت بۆ دیتنی موشتەری و ئەرباب جلیی سپۆرت لەبەر ناکەن. هەڵەی دووەم پێدانی کارتەکە بوو بەیەک دەست بەوان. لەئاسیادا کارتی سەردان "ڤیزیت" خاوەنی رێزێکی زۆرە هیچ کەسێک بەیەک دەست ئەو کارتە نادات بەکەسێکیتر بەڵکو دەبێت بەرێزەوە بەهەردوو دەست بیدات بەکەسێکیتر.

لەلایەکیترەوە گری بەخێرایی کارتەکانی کردە گیرفانی. لەئاسایدا خەڵکی لەکارتی ڤیزیت بۆ دەسپێکی ئاخاوتن بەکاری دێنن. نابێت تۆ کارتەکە بەخێرایی بکەیتە گیرفانت یان کیفەکەتەوە کاری هەڵەی گری ئەمە بوو کارتەکانی بەپەلە کردە گیرفانیەوە ئەمەش بەبێ رێزیی هەژمار دەکرێت. هەڵەیەکی دیکەی گری ئەمە بوو بەدەست ناوی خۆی نوسی کەلەژاپۆندا رەفتارێکی خوازراو نییە. بیل، یەکێ لەهاورێکانی گری دواتر پێی وت نابێ دیارییەکەی ئەوان لەبەردەم خۆیاندا بکرێتەوە، چونکە ئەگەری ئەوەی هەیە ئەو دیارییە لەچاو دیاری بەرامبەریدا کەمتر بێت. هەرچەن گری دیاریی بەوان نەدابوو سەرەنجام لەبەشی لەئامێزگرتنی کەسی بەرامبەر کەژاپۆنیەکان بەتایبەتی دەربارەی کەسانێک یەکەمجار بێت ببینن هەرگیز پێیان خۆش نییە.

بەڵگەنەویستە چیتر بانگ هێشتی گری نەکرایەوە بۆ ژاپۆن، سەفەری دواتری بۆ ئیل سالوادۆ بوو کەپێش سەفەرکردن بۆ ئەو وڵاتە داب و نەریتی ئەوانی خوێندەوە توانی ڕەفتارێکی شیاو بنوێنێت.

## تەکنیکی ژمارە ٤٢

**سەرنجدانی داب و نەریت**

**هەرکاتێ دەچیتە وڵاتێکی نوێوە دەربارەی داب و نەریتی ئەو وڵاتە شارەزایی بەدەست بێنە. بەرلەوەی تەوقەیان لەگەڵ بکەیت دیارییەکیان پێ بدە یان باسی کەسێکی ئەوان بکە، پێشتر بزانە ڕەفتارت دروستە یان هەڵەیە.**

## ٤٣

## چۆن باشتر بکڕیت

لەئامادەکردنی ئەوەی دەتەوێ تواناکانی کەسانیتر بەکەم مەزانە. زۆرێك بۆ گرتنی مێزێك لەریستۆرانێکی قەرەباڵغ ناوی کەسانی ناودار بەکاردێنن. ڕەنگە کەسێك بیەوێ لەهۆتێلێکی گەورەدا بمێنێتەوە کەشوێنی نەماوە پاشان هاوار بکات تاکو شوێنێکم پێنەدەن لێرە لەسەر ئەم زەوییە دەخەووم بانەوەش بڵێم من عادەتمە بەبێ پێخەف بنووم. ئەم ڕەوشە منالانەیە ڕەنگە کارساز بێت بەلام ئێمە ئەم ئامۆژگارییە ناکەین. لەجیاتی ئەمە من ڕەوشی "بلۆف لێدان لەچەنەبازیی" راسپاردە دەکەم.

ڕۆژێك لەگەڵ یەکێ لەفرۆشیارانی بیمە بەناوی کارسۆن، قسەم دەرد. دیویست بیمەیەکی بواری خانوم پێ بفرۆشێت هەڵبەت من دەمویست بیمە زیاتر کۆ بێتەوە من کەمتری پێبدەم. گارسۆنی بەحەوسەلە دەربارەی هەقی ئەم بیمەیە کەدەیویست بیفرۆشیت قسەی دەکرد.

دروست کاتێ دەربارەی بەلای وەك جەنگو ڕەشەباو زریان قسەی دەکرد. زەنگی تەلەفۆنەکەی لێیدا. بەداوای لێبوردنەوە هەڵیگرت. یەکێ لەهاوکارانی بوو. لەناکاو پێکەوە دەربارەی چەتر دەستیان بەقسە کرد من وامزانی دەربارەی هەوا قسە دەکەن. پاشان باسی فلۆتریان کرد من وامزانی دەربارەی گرفتێکی چاو دەدوێن کەچی باسەکەیان لەسەر شتێکی دیکە بوو.

پاش چەن خولەکێ کارسۆن خواحافیزیی لەهاوکارانی کرد پەیوەندییەکە تەواو بوو. کارسۆن گەرووی خۆی ساف کردو گەڕایەوە حاڵەتی یەکەم تاکو قسە لەگەڵ مندا بکات. پاشان بیرم کردەوە ئەگەر هاوکارەکەی کارسۆن دەیویست بیمەیەك بکڕێت، دەیتوانی پارەکەیەکی کەمتر بدات، لەهەر پیشەیەکدا فرۆشیاران دوو نرخیان هەیە نرخێکیان بەکەسانی خۆیی و کەسانێك سەریەخۆیان بن و لەگەڵ خۆیان کاربکەن ئەویتریان ئەو نرخەیە بەمن و تۆی دەدەن.

کاتێ دەتەوێ شتێك بکڕیت هەبونی کەمێ زانیاری پێویستە. یەکێ لەهاوڕێکانم دیکۆریستێکی باڵاخانەکانە پێی وتم: "دەبێت بزانی لەگەڵ دیکۆریستەکان چۆن قسە دەکەیت تاکو پارەیەکی کەمتر بدەیت." پرسیارم لەمبارەیەوە لێکرد تاکو زیاتر ڕوونی بکاتەوە. ئەو وتی: "بەتایبەت ئەگەر ژن بیت دەبێت دیقەتی ئەوە بدەیت زیاددت لێوەرنەگرن. کاتێ دەتەوێ گرێبەستێکی دیکۆر واژۆ بکەیت. پێی بڵێ دیوارەکان ساغ و بێخەوشن. ڕەنگێکی زۆریان پێویست نییە تۆش کاتێکی زۆر خەرج ناکەیت بەمجۆرە ئەو کرێیەی لێت وەردەگرن کەمتر دەبێت هۆکاریش ئەمەیە ئەوان دەزانن تۆ شارەزاییت لەبارەیەوە هەیە." بەڵام ئەگەر کەسێك نەبوو لەژیاندا ڕێنماییت بکات چی دەکەیت؟

بۆ گەیشتن بەباشترین نرخ دەتوانی بەمشێوەی ژێرەوە کار بکەیت. ئەگەر لەو پیشەیەدا بەتایبەت کەسێك دەناسیت سەردانی ئەو کەسە بکە. ئەگەر نا لەجیاتی فرۆشیارێك لەگەڵ چەن فرۆشیارێکدا قسە بکە لەهەر یەکێکیان بابەتێك فێر دەبیت.

بۆ نمونە دەتەوێ پارچەیەك زێر بکڕیت، لەجیاتی ئەوەی ڕاستەوخۆ بچیتە لای زەڕنگەرەکەی ناسراوت بچۆ بۆلای ڕکابەرەکانی ئەو بزانە زەڕنگەر لەجیاتی

بەکاربردنی وشەی زێڕ سوود لەوشەی سەنگ وەردەگرێت بۆ هەر بەشێکی کارەکەیان واژەیەکی تایبەتیان هەیە فێری ئەمانە ببە.ئێستا بەوەزیبەی بەزمانی زێڕ دەدەوێیت، دەتوانی نرخێکی کەمتری پێبدەیت.

## تەکنیکی ژمارە ٤٣

### مشتومڕی باشتر

کارامەیی چەلەحانێ پێشتر لەوڵاتانی عەربی ڕەواجی هەبوو دەتوانرێ لەهەموو بازاڕەکان سوودی لێ ببینرێ. کاتێ جۆری مامەڵەکردن بزانی نرخێکی کەمتری پێدەدەیت.

بەرلەوەی کڕینێکی گەورە بکەیت، سەردانی چەن فرۆشیارێك بکە. چەن زانیارییەك لەچەن کەسێکی ئەو بوارەوە وەرگرە. کاتێ ئاشنای زمان و زاراوەی کەسانی پیشەوەر دەبیت بەئاسانی دەتوانیت شتەکان بکڕیت.

## بەشی پێنجەم

## باز لەگەڵ باز کۆتر لەگەڵ کۆتر

## "بۆچی هاوشێوەی یەکترین"

ئەگەر سەیرێکی ئاسمان بکەیتو سەیری فڕینی باڵندەکان بکەیت. دەبینیت باڵندەی هاوشێوەی یەکتر پێکەوە دەفڕن هیچ باڵندەیەکی ناهاوشێوە پێکەوە نابینیت بفڕن.

خۆشبەختانە مرۆڤەکان هۆشیارترن لەباڵندەکان. ئێمە خاوەنی مێشکینو بەهۆیەوە دەتوانین بەسەر خۆماندا زاڵ بین. کەسانی هۆشیارو زرنگ پێکەوە کاردەکەن، یاری دەکەن، پێکەوە نان دەخۆن ئایا ئەمە بەو مانایەیە ئاستی ئاسودەیی ئەوان لەڕوبەرێکی بالاتردایە؟ ئەمە پەیوەستە بەمرۆڤەوە. بەبێ کەمترین گومان سەلمێنراوە مرۆڤەکان بەدوای کەسانێکدا دەڕۆن کەلە بەها هاوشێوەکانیاندا یەکسان بن. لەمیانەی توێژینەوەیەکدا ئەزمونی کەسێتیو باوەڕیان دایە کۆمەڵێك. پاشان هەردوو کەسەو پێکەوە دانیشتن داوایان لێکردن پێکەو کاتێك بەسەر بەرن. بەرلە چاوپێکەوتن بەنیوەی جوتەکانیان ووت لەڕوی بیروباوەڕو بەهاکانەوە لەگەڵ هاوتاکەیاندا هاوشێوەن. بەنیوەکەی تریان وت لەگەڵ هاوتاکەیان خاڵێکی هاوبەشیان نییە. ئەمەش لەکاتێکدا بوو هیچ یەك لەم دوو قسەیە ڕاست نەبوو.

پاش ماوەیەك دەرکەوت ئەوانەی وایاندەزانی لەیەك دەچن بەبەراورد لەگەڵ گروپی دووەم زیاتر یەکتریان پێخۆش بوو. ئێمە زیاتر حەزمان لەتێکەڵاوی کەسانێکە لەگەڵیاندا باوەڕی هاوشێوەمان هەبێت. لەم زەمینەیەدا من ئاماژە بەشەش تەکنیك دەکەم کەبۆ هەرکەسێك بتەوێ بگەیتە هەستو بەهای هاوبەش.

٤٤

## چی بکەیت هەستی ئەوە بکەن تۆ لەیەك چین بیت

دروست وەك ئەوەی باز لەهەڵۆ خێراتر دەفرێت. کەسانی بوارە جیاوازەکان هەریەکەو بەخێراییەکی جیاواز دەبزوێن. بۆ نمونە ڕۆژئاواییەکان زۆر لەیەکتری دوردەکەونەوە لەژیان دوردەکەونەوە، بەڵام ڕۆژهەڵاتییەکان کەلە کۆڵانی تەنگو شوێنی تەسکی شەمەنەفەرەکاندا لەتەنیشت یەکترییەوە دەبن پێکەوە پەیوەندی نزیکتریان هەیە.

کامیان ڕەفتاریان دروستترە؟ ئایا لایەنەکەی دیکە لەهەڵەدان؟ نا، بەڵام ئەو کەسانەی پێکەوە چۆنێتیەکی هاوبەشیان هەیە ئاسانتر دەتوانن پێکەوە بن.

ڕۆژێك پەیامنێرێکی تەلەفزیۆن لەو هاوڕێیەم کەسیمینارێکی زۆری لەبواری "چۆن هاوسەرگیریی لەگەڵ دەوڵەمەنداندا بکەین." بەڕێوە دەبرد، لە"لاسفیکاس" پرسی ئایا دەکرێ لەنێوان دەوڵەمەندانی ڕاستەقینەو کەسانێك بەڕواڵەت دەریدەخەن کەدەوڵەمەندن جیاوازییەك بکەین؟

جینی، وتی: "بێگومان."

پەیامنێرەکە وتی: "زۆر باشە کێ لێرە لەهەمووان دەوڵەمەندترە؟"

لەمێزەکەی تەنیشتەوە سێ پیاو بەجلی شیكو فەرمییەوە دانیشتبون کەدیاربوو هەر یەکەیان دەوڵەمەند بوون، پەیامنێرەکە گریمانەی ئەوەی کرد کەجینیی یەکێ لەمانە هەڵدبژێرێت.

جینی چاوی بەژورەکەدا گێڕاو لەسەر کەسێك چڕ بویەوە کەپانتۆڵێکی دڕاوی لەپێدا بوو لەگۆشەیەك دانیشتبوو. پاشان بەچپەوە وتی: "ئەو زۆر دەوڵەمەندە."

پەیامنێرەکە لەجینی پرسی چۆن ئەمەی جیاکردەوە؟ جینی وتی: "ئەو وەك پارەی کۆن دەجولێیت." پاشان ڕونی کردەوە وتی: "جوڵەیەك وەك پارەی کۆنە، جوڵەیەك وەك پارەی نوێیە، جوڵەیەکیش هەیە هیچ لەپارە ناچێت."

### تەکنیکی ژمارە ٤٤

**کۆپی بکە**

لەکەسەکان دیقەت بدە. هەرکامێك بەشێوەیەك دەجولێت. هەوڵبدە بەشێوەی ئەوان جەستەت بجولێنیت. بەمجۆرە دەتوانی وەك هەریەکێ لەوان بجولێیت لەگەڵیاندا نزیکی پەیدا بکەیت.

٤٥

## چۆن ئەو هەستە بەوان بدەیت وەك
## ئەندامی خێزانی خۆیان هەژمارت بکەن

ئایا تا ئێستا ئەوە ڕویدا لەگەڵ کەسێکی تازە ناسراودا بدوێیتو پاش چەن ساتێك بڵێیت: "منو ئەو وەکو یەك قسە دەکەین. ئێمە لەسەر شەپۆلێکین." هەستێکی نایابە لەعاشقبون دەچێت. عاشقان بەمە دەڵێن "کاریگەری سۆزداریی بەرامبەر." هاوڕێی نوێکان پێی دەڵێن"پەیوەندی کاریگەری خێرا" بازرگانەکانیش پێی دەڵێن "بەیەکگەشتنی زەینەکان" بەهەموویان یەك مانایان هەیە. هەستێکی گەرمی کتوپڕ لەوەیکە "ئێمە لەیەك ساتدا بگۆڕێین بەهاوڕێی دێرینە."

کاتێ منداڵ بوین هاوڕێگرتن بەلامانەوە ئاسان بوو. زیاتر ئەو منداڵانەمان دەناسی لەشاری خۆماندا گەروە بوبون بۆیە لەسەر یەك شەپۆل بوین. دوای ساڵانێك گۆڕانی ژیان سەرەنجام درێژیی شەپۆلەکەمان گۆڕانکاریی بەسەردا هات. ئایا سەیرو موعجیزە نییە هەر ساتێك بتەوێ لەدرێژایی شەپۆلی کەسانیتردا خۆت ببینیتەوە؟ لێرەدا بەدەربڕینی قسەیەك ئاشنا دەبێ دەتوانیت بەهۆیەوە بەخێرایی لەگەڵ کەسانیتردا پەیوەندی ببەستیت. ئەگەر لەناوچەیەکی شاخاوی یان لەدۆڵێکدا هاوار بکەیتو قسەیەك بکەیت ئەو قسەیە یان ئەو هاوارە بەرەو خۆت دەگەڕێتەوە. من ناووم لێناوە "دەنگدانەوە" وەك دەنگدانەوەیەك لەکێوێکدا گوێت لێی دەبێتەوە قسەکانی کەسی بەرامبەر کتومت دەنگ دەداتەوە.

هەموو شتێك لەتۆقیانوسدا ڕوو دەدات

لەزۆرێك وڵاتانی ئەورووپا خەڵکی بەپێنج تەنانەت بەدە زمانی جیاواز قسە دەکات. هاوکات هەر ناوچەیەك بۆ خۆی هەزاران وشەی هەیە بەکاری دێنێت.

کەسانی سەر بەخێزانێك وەکو یەك دەدوێن. هاوڕێکانیان زمانی هاوشێوەی ئەوانیان هەیە، هاوکاران‌و ئەندامانی کۆمپانیایەك هاوشێوەی یەکتریی دەدوێن.

هەمووومان بەدرێژایی شەپۆلێکدا دەڕۆین

کاتێ دەتەوێ ئەم هەستە بدەیت بەکەسێك کەتۆش هاوشێوەی ئەوویت. وشەکانی ئەو بەکاربێنە. گریمان دەتەوێ ئۆتۆمبێلێك بەدایکێك بفرۆشیت کەدەڵێت منداڵێکی دووساڵەی هەیە. کاتێ دەتەوێ دەربارەی ئۆتۆمبێلەکە بدوێیت سوود لەزمانی ئەو دایکە ببینە.

ئەو وشانەی کەخۆتان بۆ ناوهێنانی منداڵەکەتان بەکاری دێنن لێرەدا سوودی لێ ببینە. ئەگەر دایك لەوشەی منداڵ سوود دەبینێت تۆش لەهەمان زمان سوود ببینە.

دەنگدانەوە لەمیوانیدا

وابزانە لەمیوانیەکدایت‌و کەسانی جۆربەجۆر لەوێ ئامادەن. ئەگەر لەگەڵ بریکارێك قسە دەکەیت کەئاماژە بە"پیشە"کەی دەکات تۆش لەوەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ئەودا لەواژەی پیشە لەجیاتی ئیش‌و کار سوود ببینە ئەگەر تۆ وشەی ئیش بەکار بێنیت ئەوا ناخواستەو بێئەوەی بزانیت بەربەستێك لەنێوان خۆت‌و ئەودا دروست دەکەیت.

ئێستا وابزانە لەگەڵ بیناسازێکدا دەدوێیت کە ئەو بە"ئیش"ەکەی خۆی ئاماژە دەکات لەم حاڵەدا ئەگەر قسە لەسەر "پیشە" بکەیت لەگەڵ ئەو کەسەدا دەگەیتە بنبەست. هەڵبەت سوود وەرگرتن لەڕەوشی دەنگدانەوە بەئیش کورت

نابێتەوە لەگەڵ هەرکەسێکدا قسە دەکەیت هەوڵبدە قسەو زاراوەکانی خۆی دووبارە بکەیتەوە.

☆ **تەکنیکی ژمارە ٤٥**

**سوود وەرگرتن لەڕەوشی دەنگدانەوە**

**ئەمە یەك تەکنیکی زاراوەیی و زمانێکی ئاسانە کەسوودێکی فراوانی هەیە، سەرنج لەو وشانە بدە کەسی بەرامبەر بەکاریان دەبات و دووبارەیان بکەرەوە. کاتێ وشە بەکاربراوەکانی کەسی بەرامبەر بەکار دێنیت پەیوەندییەکی بتەو دەبەستیت. بەمجۆرەش ئەوان هەست بەوە دەکەن تۆ ئاشنای بەهاکانی ئەوان بوویت سەرەنجامیش زیاتر لێت نزیك دەبنەوەو هاوڕێیەتیت دەکەن.**

سوود وەرگرتن لەڕەوشی دەنگدانەوە

تۆ لەگەڵ دەرمانسازێکدا قسە دەکەیت لێی دەپرسیت: "ماوەی چەندە لەم شوێنە کار دەکەیت؟" هەڵەی ئەم پرسیارە لەکوێدایە؟

هەڵە لەو شوێنەدایە. دکتۆرە دەرمانسازەکان وشەی دەرمانخانەیان پێ باشترە.

هاوڕێیەکم هەیە لەسەر گالیسکەی چەرخدارە، ئەو پێی خۆش نییە پێی بوترێ کەمئەندام. ئەو پێی باشە ئەو کەسە بناسێت خاوەن پێداویستی تایبەت بێت.

شتەکە زۆر ئاسانە ئەگەر دەتەوێ جێگەی سەرنج بیت وشەی بەکاربراوی کەسی بەرامبەر دووبارە بکەرەوە بەمجۆرە پەیوەندیەکی کاریگەری زیاتر لەنێوانتاندا بەدی دێت.

٤٦

## چۆن بدوێین تاکو ئەوان ئاگایان لێ بێت

لەم دواییانەدا لێدوانێکم بۆ ١٥ کەسی کۆمپاینادا. بەخۆمم وت ١٥ مەریخی‌و یەک ڤینۆسی وتم کێشە نییە من پێشتر کتێبی پیاوانی مەریخی‌و ژنانی ڤینۆسیم خوێندۆتەوە. دەربارەی جیاوازی دەماریی نێوان ژن‌و پیاو شارەزاییم هەبوو، بەهەر شێوەیەک بێت جیاوازییەکانی نێوان ژن‌و پیاو پەیوەندەکەمەوە. تەواو ئامادە بووم قسە بۆ ئەم پیاوانە بکەم بیرو ڕای خۆمیان بۆ دەربڕم دەربارەی هەر پرسیارێك وەڵامی خۆم بدەمەوە.

هەموو شتێك بەچاکی چویە پێشەوە، من بەرنامە لێدوانەکەی خۆمم بەوردی ئامادە کردبوو. کۆڕەکە بەچاکی هاتە کۆتایی. پاشان بەخەیاڵێکی ئاسودەوە دانیشتم‌و وتم هەرکەس پرسیارێکی هەیە با بیکات.

لەم کاتەدا بوو کار گەشتە دژواریی. هەریەک لەئامادە بووان بەئامارە بۆ یاری تۆپی پێ‌و ئەو شتانەی زیاتر پیاوانە بوون پێوانەیان دەکردو منیش ناچار بووم بەڕەچاوکردنی دەربڕینەکانی ئەوان وەڵامیان بدەمەوە. وریابە دەبێت هەوڵی ئەوە بدەیت بەڕەچاوکردنی ئەزموون‌و شارەزایی کەسانێك کەقسەیان بۆ دەکەیت نمونە بێنیتەوەو پێوانە بکەیت، بۆ نمونە ئەگەر لایەنی بەرامبەر یاریزانێکی تێنس بێت ئەو وشانە لەگەڵ بەکار بێنە لەیاری تێنسدا هاتووە، ئامانجی ئەم کتێبەش ئەمەیە پەیوەندی باشترت فێر بکات. بۆیە ئەم ڕەوشەم تاقیکرد بەڕەچاوکردنی پێوەرو ئەزمونی ئەو کەسانەی بۆیان دەدوێیت.

☆ تەکنیکی ژمارە ٤٦

**بەکار هێنانی پێوەر**

**ئایا موشتەریەکەی تۆ باخێکی هەیە؟ لەگەڵ ئەودا دەربارەی "چاندنی تۆو بۆ بەدی هێنانی سەرکەوتن" بدوێ. ئایا سەرۆکەکەت بەلەمی هەیە؟ لەگەڵ ئەودا دەربارەی مەلەکردن بەئاراستەی ئاو بدوێ. ئایا ئەو فرۆکەوانە؟ دەربارەی فڕین و نیشتنەوە بدوێ. ئایا ئەو یاری تێنس دەکات؟ دەربارە هاویشتنی تۆپەکە دروست بدوێ. حەزی گوێگرەکەت بدۆزەوەو لەو بارەیەوە بۆی بدوێ . پێوەرەکان لەدنیای گوێگرەکەتدا بدۆزەوە. بەمجۆرە گوێگرەکانت دەگەنە ئەم ئاکامەی تۆ لەگەڵ حەزو خولیاکانی ئەودا هاوبەشیت.**

☆ ٤٧

## چی بکەین وابزانن هاودەردی ئەوانین

کاتێ گوێ بۆ قسەی کەسێك دەگرین، زیاتر بەدەنگی وەك: "ئێ"، "ئاوا"، "سەیرە" نیشانی دەدەین گوێمان بۆ قسەکانی ئەو گرتووە.
یەکێ لەهاورێکانم بەناوی فیلیپ زیاتر لەگوێگرتنی بۆ قسەکانی من ئەم وشانە بەکار دێنێت، بۆ ئەوەی سەر بکەمە سەری، لێی دەپرسم: "باشە، بڵێ بزانم چیم وت؟"
ئەو ناتوانێ بەتەواوی وەڵام بداتەوە، دیارە خەتای ئەو نییە. ئەو ڕەگەزی نێرە. پیاوان لەکاری گوێگرتندا هێندە خەتابار نین. دیارە سەر تەکانداندو "ئێ" و "ئاوا" وتن باشتر لەجوڵەی لەخۆ نیشان نەدانە. بەڵام بەستەری پەیوەندی بتەو ئەم ڕەوشە بەکار نابەن لەجیاتی ئەوە لەڕەوشی هاودڵانە بەهرە وەردەگرن.

### چۆن دەتوانیت هاودڵانە رەفتار بکەیت؟

لەجیاتی ئەوەی وشەی "ئێ" و"وایە" بەکاربەریت، ڕستەی وەك "بڕیارێکی باشت داوە"، "بەڕاستی نایابە" بەکاربێنە.

کاتێ لەجیاتی بەکاربردنی کورتە وشە ڕستەی تەواو بەکار بێنیت، کەسی بورامبەرت دەگاتە ئەو ئاکامەی بەتەواوی گوێت بۆ قسەکانی گرتووە.

تەکنیکی ژمارە ٤٧

**پشتگیریی هاودڵانە**

**لەجیاتی بەکاربردنی وشەی وەك "ئێ"، "وایە"، بۆئەوەی نیشانی بدەیت گوێت بۆ قسەکانی کەسی بەرامبەر گرتووە ڕستەی تەواو بەکار بێنە: "بەڵێ، ئاگام لەمەبەستەکەتە." کردنی قسەی هاودڵانەو پشتیوانیکردنی کەسی بەرامبەر زیاتر تامەزرۆی ئاخاوتنت دەکات.**

دیارە بۆ وتنی وشەی پشتیوانی دەبێت بەدیقەتەوە گوێ بگریت. ئێستا بۆ زیاتر زاڵ بوون بەدەرکی هاودڵانە زیاتر ڕونکردنەوە دەکەین.

## ٤٨

## چی بکەین ئەوان وابزانن تۆ وەکو ئەوان

## دەبینیت، دەبیستیت، هەست دەکەیت

نزیکەی ١٠ ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ مامۆستایەکی هونەر کەناوی برندا بوو لەژوورێکدا پێکەوە بووین. ئەو خولیای لێدانی تەپڵ بوو. لەم ژور بۆ ئەو ژور دەچوو بەپەنجەکانی تەپڵی لێدەدا، کەمێ دەنگە دەنگی دەکرد، بەڵام من گوێم پێنەدەدا.

ڕۆژێك لەبرندام پرسی چۆن بوو حەزی لە تەپڵ لێدان کرد؟ وەڵامیدایەوە: "لەو ساتەی گوێیەکانم کرانەوە." قسەیەکی سەیر بوو. زۆربەی خەڵکی دەڵێن: "لەو ساتەوەی چاووم کرێتەوە." من گەشتمە ئەم ئاکامەی کەبراندا زیاتر دنیا بەگوێیەکانی دەبینێت.

هەمووومان بەپێنج هەستەکە ئەزمونی دنیا دەکەین، دنیا دەبینین، دەبیستین،دەست لێدەدەین، بۆن دەکەین، تام دەکەین، بەپێێ ئەم پێنج هەستە قسە دەکەین لەئێن ئێل پی، یان داتای دەماریی قسەیەك دەخوێنین هەرکەس لەیەکێ لەم هەستانەی بەهێزترە لەهەستەکانی دیکەی، سەبارەت بەبراندا هەستی بیستنی لەهەستەکانی تری بەهێزتر بوو.

براندا پێی وتم لەماڵێکدا کەنهۆمێکی ژێرزەمینی هەبووە گەورە بووە. ئەو دەنگی پێی ئەو کەسانەی بەسەرەوەی ئەودا دەرۆشتن لەجێگەی نوستنەکەیەوە دەبیست.

لەتەمەنی دوو یان سێ ساڵەییدا لەژێر بۆمبارانی دەنگی جیاوازدا ژیاوە، ئەو بەتایبەت دەنگی پێی ئەسپی پۆلیسی لەسەربانی ماڵەکەیانەوە بیستووە ئەوانەی بیر ماونەتەوە، بۆیە یەکەم پەیامی دنیای دەرەکی لەڕێی گوێیەکانیەوە پێگەیشتوون، تاکو ئەمڕۆ هەموو دەنگەکان بەسەر ژیانیدا زاڵە، براندا کەسێکی بیسەرە. بەپێی ئەوەی پسپۆڕانی دەماریی دەڵێن لەسەر بەهێزترین هەستی مرۆڤەکان کار بکەن. من لەدەربڕینەکانم لەگەڵ براندا ئەو وشانە بەکار دێنم هەستی بیستنی ئەو زیاتر بەکار بێنم.

بۆ نمونە لەجیاتی ئەوەی پێی بڵێم "بەچاکی ئاگام لەمەبەستەکەتە"، دەڵێم "قسەکانت مانادارن." لەو کاتەوەی ئەم یاسایە ڕەچاو دەکەم، ئەو زیاتر سەرنجی لای قسەکانمە.

لەم ڕووەوە لەهاوڕێکانم ورد دەبمەوە تاکو هەستی زیاتر بوونو بەهێزتر بوونیان تێدا بدۆزمەوە، هەندێکیان دیدارینو دیداری دەدوێن. بۆ نمونە دەڵێن:

"بەڵێ، ئاگام لەمەبەستەکەت."

"جوان دیارە."

"لەخۆم ڕانابینم ئەم کارە بکەم."

"لێکدانەوەیەکی لاوازم هەیە."

"بەسەرنجدان لەتێبینی من..."

*چرچ و لۆچی ئێنە ئاراوە*

بەڵام دواتر ڕۆژێك لەهەمان کەسیی پێشوو دەبیستم لەم دەربڕینە بیستراوانە سوود دەبینێت. بۆ نمونە دەڵێت:

"بەڵێ، گوێم لەقسەکەی تۆیە."

"بەڵێ، قسەیەکی نایابە." "بەردەوام بەخۆم دەڵێم ئەم ڕەوشە کاریگەریی دەبێت." "دەنگێکی نەرێنی لەگوێمدا هەست پێدەکەم."

"شتێك پێم دەڵێت..."

بۆ من شتێکی ئاسان نەبوو. بەڵام بڕیارمدا لەمبارەیەوە زیاتر توێکاری بکەم. ڕۆژێکیان لەگەڵ براندا چوین بۆ یاری ئەسکێت" خلیسکێنە" شەو لەشوێنی کۆبونەوەی ئەسکێتبازەکان کۆ بوینەوە. هەرکەسەو قسەیەکی دەکرد. من بەسەرنجدان لەقسەی هەریەکێکیان دەرکم بەهەستی ئەو دەکرد. بۆ نمونە یەکێك بیسەریی بوو، یەکێك هەستی دەست لێدان، ئەویتر دیداریی.براندا وتی: "ئەمڕۆ زۆر بێدەنگ بوو. تەنها دەنگێك دەبیسترا ئەویش شنەی با بوو."بەمەش هێشتا بەلامەوە دژوارە هەستی زۆر کەس دیاری بکەم.

ڕێچارێکی ئاسان:

ڕەوشێکم دۆزییەوەئاسان دەردەکەوێ ناچار نیت توێژینەوەی زۆری لەسەر بکەیت، من ناووم لێناوەقسەی هاودڵانەی دروست. زاڵ بوون بەسەر ئەم ڕەوشەدا سادەیە، هێندە بەسە ئەو ساتەی کەسێك قسە دەکات لەقسەکانی دیقەت بدەیت. بۆ نمونە ڕەنگە هاوکارەکەت لەبواری بەرنامەڕێژیی داراییدا بڵێت: "بەپێی ئەم بەرنامەڕێژییە لەهەمان شەش مانگی داهاتوودا بەئاشکرا دەردەکەوێ." لێرەدا ئەم کەسە تێڕوانینێکی هەیە لەوەلامیدا ڕستەیەك بڵێ قسەکەی تۆ تەکانێکی دیداریی بنوێنێت "بەڵێ، وێنەیەکی ڕۆشن لەقسەکانی تۆوە دەبینم." بەلام ئەگەر کەسەکە دەستەواژەکەی بەڕێتمی بیسەریی دەربڕی ئەوا تۆش سوود لەدەستەواژەی بیسەری ببینە "بەڵێ، قسەکانت بەتەواوی دەبیستمو دەرکی پێدەکەم."

دواجار ئەو کەسەی قسە دەکات سوود لەدەستەواژەی بەرکەوتن "دەست لێدان" دەبینێت ئەوا وەڵامی دەست لێدانی بدەرەوە. ڕەنگە بیت بڵێن "لەناخی دڵەوە هەست دەکەم بەرنامەیەکی باش بێت" ئەویش وەڵام دەداتەوە: "هەستتان ڕاست دەکات." یان "لێکدانەوەی دروستت بۆ کەسەکە هەیە."

**تەنکیکی ژمارە ٤٨**

**ڕەوشی دروستی هاودڵانە**

**چ بەشێك لەهەستەکانی ئەواندا دەرك پێدەکەیت؟**

**چاوەکانیان، گوێیەکانیان یان هەستەکانیان؟ دەربارەی دیدارییەکان قسەی هاودڵانەو دیداریی لەبارەی بیستنەکانەوە قسەی هاودڵانەی بیسەریی و سەرەنجام دەربارەی دەست لێدانەکان و هەستەکان سوود لەقسەی هەستەوەریی ببینە.**

٤٩

## چی بکەین لەجیاتی منو تۆ
## ئەوان بیرمان لێبکەنەوە

بەکەمێك گوێگرتن لەقسەی دوو کەس دەتوانیت دەربارەی پەیوەندی ئەوان قسە بکەیت. دەوانیت بڵێت هاوڕێی نوێن یان هاوڕێی دێرینەی یەکترین. دەتوانیت بڵێیت ئەوان ئەگەر ژنو پیاوێك بن، ژنو مێردن یان نا. لەوەی ئەوان چۆن یەکتریی دەدوێنن گرنگ نییە. گرنگ نییە بەیەکتری دەڵێن خۆشەویستم یان نا، ئەو تەکنیکەی دەمەوێ بەئێوەی بڵێم پەیوەندی بەزمانی جەستەوە نییە. بابچینە سەر بابەتی سەرەکی.

### ئاستی یەك: کلێشەکان
کاتێ دوو کەسی نەناسراو بەیەکتر پێکەوە دەدوێن، قسەی کلێشەیی دەکەن، بۆ نمونە کاتێ دەربارەی کەش و هەوا دەدوێن ڕەنگە یەکێکیان بڵێت: "چەن هەوایەکی خۆشم هەیە." یان "باران؟ سەیرە!" ئەمە ئاستی یەکەمە، کلێشە.

### ئاستی دوو: ڕاستییەکان
ئەو کەسانەی یەکتریی دەناسن. بەڵام پەیوەندییەکەیان لەئاستی ئاشنایدایە، ئاماژە بەڕاستییەکان دەکەن: "جوزیف، دەزانی دوو بەرامبەر پارساڵ کەشێکی

ساماڵی هەبوو." یان "سەرەنجام ناچار بووین ئەستێلێک دروست بکەین تاکو کەمێ لەبەڵای هەوای گەرم ڕزگارمان بێت."

ئاستی سێ: هەستەکانو پرسیاری تایبەت
کاتێ کەسەکان پێکەوە دەبنە هاوڕێ. زیاتر هەستەکانیان بۆ یەکتری دەردەبڕن. "جۆرج نازانی چەندە حەزم لەو ڕۆژە ساماڵانەیە." ئەوان پرسیاری تایبەت لەیەکتریی دەکەن: "باشە، ئەی تۆ؟ تۆش حەزت لەڕۆژی ساماڵە؟"

ئاستی چوار: دەربڕینی ڕاناو
ئێستا دەگەینە باڵاترین ئاستی هاودڵیی، ئەم ئاستە لەڕاستییەکان بەهێزترەو لەهەستەکان پەیوەندییەکی کاریگەرتر بەدی دێنێت. ئەمانە دەستەواژەیەکن لەئێمەو پێکهاتەکانی ئێمە سوود دەبینن. ئەو هاوڕێیانەی دەربارەی کەش و هەوا دەدەوێن ڕەنگە بڵێن: "ئەگەر ئەم کەشە بەردەوام بێت. ئێمە چاوەڕوانی هاوینێکی زۆر خۆشی لێدەکەین." یان ژنو مێردەکان ڕەنگە بڵێن: "ئەگەر ئەم کەش و هەوایە بەردەوام بێت، دەتوانین سەفەرێکی خۆشی تێدا بکەین."
بۆ ئەوەی قسەکانت زیاتر گەرم بێت، دەتوانیت زیاتر لەڕاناو ئێمە سوود ببینیت.
کاتێ بەشێوەیەکی ڕێکو پێک تەنانەت بۆ نەناسراوەکان وشەی ئێمە دەڵێیت بەشێوەی ناخودئاگا ئەوان دێنیتە ڕیزی هاوڕێکانی خۆتەوە. ئەگەر لەڕیزێکدا وەستاویت دەتوانیت بەکەسی دوای خۆت بڵێیت: "گەلێک نایابە بەڕاستی بۆ ئێمە میواندارییەکی جوانیان ڕێک خستووە." یان "جوانە، ئەگەر هەموو ئەمانە بخۆین بەڕاستی چاک قەڵەو دەبین."

**تەکنیکی ژمارە ٤٩**

**سوود بینین لەوشەی ئێمە**

**تەنانەت ئەگەر خولەکێ پێشتر کەسێکت ناسیوە. لەپەیوەندیکردن بەو کەسەوە سوود لەوشەی ئێمە ببینە. لەئاستی یەک و دوو گەڕێ خەریکی ئاستی سێ و چواربە بەبەکاربردنی وشەی ئەفسوناوی ئێمە هەستێکی هاودڵیی لەگەڵ کەسانیتر بەدی دێنێت.**

تاکو ئێرە دەربارەی پرسە جیاوازەکان قسەمان کرد. دواین باسی ئەم بەشە ئەمەیە لەگەڵ کەسانیتر بەشێوەیەک ڕەفتار بکە وەک ئەوەی لەمێژ بێت یەکتریی بناسن.

٥٠

## چۆن نوكتەی دۆستانە بگێڕینەوە

عاشقان دەربڕینێك بەگوێی یەكتریدا دەچپێنن بێجگە لەخۆیان بۆ هیچ كەسێك چەمك و مانایەكی نییە. هاوڕێكان جۆرێك قسە بۆ یەكتریی دەكەن كەسانیتر سەری لەبەر دەرناكەن.

گێڕانەوەی نوكتە بەسەرنجدان لەئەزمونی هاوبەشی نێوان كەسەكان ڕەوشێكی گونجاوی بالأبردنی دڵ و دەروون و بەدی هێنانی لایەنی دۆستانەیە. كارمەندانی هەر دامەزراویەك یان كۆمپانیایەك مێژوویەكی هاوشێوەیان هەیەو بەزمانێك گۆشكراوون ئەم ئەزمونە بگێڕنەوە. ئەم كەسانە زیاتر ئامارە بەمەسەلەیەك دەكەن بێجگە لەهاوكارانی خۆیان كەس سەری لەبەر دەرناكات.

هەرجارێك من و هاوڕێكەم داریل یەكتریی دەبینین، لەجیاتی سلأوكردن دەنگی مراوی واتا "واق واق" بەكاردێنین. ئەگەر دەتەوێ هۆیەكەی بزانی، ئەمەیە پێنج ساڵ پێشتر لەگەڵ داریل كەیەكترمان بینی ئەو وتی كێڵگەی پەروەردەكردنی مراوی هەیە. كاتێ لەمبارەیەوە پرسیارم لێكرد. بەدەمی خۆی دەنگی واق واقی كرد منیش پێكەنیم ئەوشەوەمان بەگاڵتەو گەپ بەسەر برد.

## تەکنیکی ژمارە ٥٠

**سەرنجێك لەڕابردوو**

**کاتێ چاوت بەناسراوێك دەکەوێو دەتەوێ ئەو چیتر هەست بەغەریبی نەکات، بیر لەو ساتە بکەرەوە یەکەمجار یەکتریتان تێدا بینی. لەڕوداو پێش هاتێك بیر بکەرەوە لەنێوانی ئێوەدا ڕویدا بێت. پاشان باسی ئەوە بکە.**

ڕۆژی دواتری یەکتر ناسینمان کاتێ داریل تەلەفۆنی بۆ کردم، لەجیاتی سڵاوکردن دەنگی مراوی بەکار هێنا ئەمەش بروەی بەهاوڕێی نێوانماندا تائەمڕۆ هەرکاتێ ئەو دەنگە دەبیستم دڵخۆش دەبم.

ئێستا چ شتێك ماوەتەوە؟ کاریگەریی سۆزداریی بەرامبەر، نایابی، کاریزماو منمانە بەخۆبوون سێ خەسڵەتن هەموو کەسانی سەرکەوتوو لەژیاندا لێی بەهرەمەند بوون. لەبەشی یەکەمدا هەوڵمدا دەربارەی زمانی جەستە بدوێمو لەبەشی دووەمدا قسەی خۆمانە بوونو لەبەشی سێیەمدا گوێمان لەقسەی کەسانی سەکەوتوو گرت بەشی چوارەمیش لەوە ڕزگاری کردین تاکو بەزمان بەسراو لەبەرامبەر کەسێکدا دەرنەکەوین. لەبەشی پێنجەمدا فێر بوین چۆن کاریگەریی سۆزداریی کەسی بەرامبەر قۆرخ بکەینو بگەینە هاودڵییو پەیوەندییەکی خێرای کاریگەر. ئێستا چ بابەتێك ماوەتەوە؟ دەبێت کارێك بکەین کەسانیتر سەبارەت بەخۆیان هەستێکی باشیان هەبێت بەڵام بزانە ستایش کردنو پیاهەڵگوتن چەکێکی مەترسیدارە. ئەگەر هەڵەیەك بکەیت هاوڕێیەتیتان ڕەنگە تێك بچێت. کەواتە ئێستا بادەربارەی ستایشو پیاهەڵگوتن بدوێینو بزانین چۆن بتوانین سوود لەم خەسڵەتە ببینین.

## بەشی شەشەم

### جیاوازی نێوان ستایش‌و چاکەگۆیی‌و زمانلوسیی

منالآن خاوەنی ئەو خەسڵەتەن ئەوەی دەیانەوێ بەدەستی دێنن. لەسەر ڕانی باوکیان دادەنیشن دەڵێن: "بابە، تۆچەن باشیت. دەزانم بوکەشوشەی نوێم بۆ دەکڕیت." ڕۆژی دوایی لەگەڵ دایکی لە مارکێت: "دایە، خۆشم دەوێی. تۆ باشترین دایکی دنیایت. دەزانم ئەو پاکەتە نەستەلەیەم بۆ دەکڕیت." کەسەکانیش کاتێ شتێکیان دەوێ دەست دەکەن بەستایش‌و پیاهەڵگوتن، لەڕاستیدا ستایش‌و پیاهەڵگوتن بەشی هەمیشەیی دواکارییەکانە شتێکە بۆ بەدەست هێنان کاتێ دیل کارنگی کتێبی بە"ستایش دەست پێبکەن" نووسی پانزە ملیۆن خوێنەر بەدڵ‌و گیانەوە ئەوەیان وەرگرت.

ئەمڕۆش ئێمە لەوباوەڕەداین ستایشکردن ڕێگەیەکی گەیشتنە بەخواستەکانی خۆمان. پرسی ستایشکردن وەك داخوازییەکە لەباوك بۆ کڕینی بوکە شوشەیەك‌و داخوازی لەدایکێك بۆ کڕینی پاکەتێك نەستەلە. بەلآم دنیای بازرگانی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە چیتر ئەو هەل‌و مەرجەی دیل کارنگی لەئارادا نەماوە.

لەدنیای ئەمڕۆدا زمان لوسیش ناتوانێ مەمەلەیەك سەر پێبگرێت.

### هەڵەی ستایشی ناشارەزایانە

تۆ ستایشی کەسێك دەکەیت بزەی بۆ دەکەیت‌و چاوەڕوان دەکەیت گەرمی‌و هاودڵیی ئەو کەسە هەست پێ بکەیت کەستایشت کردووە. بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی ستایشی دەکەیت بگاتە ئەم ئاکامەی ستایشەکەی تۆ لەخزمەتی خۆتدایە. ئەوا ستایشەکەت ئەنجامێکی پێچەوانەی دەبێت. ئەگەر ستایشەکەت لەناخەوە نەبێت یان هاوتای کارامەیی پێویست نەبێت ئەگەری بەدی هێنانی متمانە لەبار دەبات‌و دەتوانێ پەیوەندی هێشتا نەبەستراو شکست پی بێنێت.
بەڵام ستایشی شارەزایانە شتێکی تەواو جیاوازە.
کاتێ ستایشکردن بەدروستی ئەنجام بدرێت. دەسبەجێ هاودڵیی لەنێوان کەسەکاندا دروست دەکات. بەڵام چ جیاوازییەك لەنێوان ستایش‌و زمان لوسیدا هەیە؟ هۆکاری جیاواز دێنە مامەڵەوە کەدەتوانن بەهاودڵیی. کاتی گونجاو، هەژێن‌و بەکاربردنی وشەی تەواو ئاماژە بکات. وێنەی زەینی گونجاو وەرگری ستایشکردن. پێگەی پیشەیی.
داوەریی‌و ئیدراك گرنگن. دیارە ئەمەش گرنگە کەئێوە هەردوکتان لەکەیەوە دەناسن. توێژینەوەی کۆمەڵناسیەکان نیشانی دەدەن ستایشی کەسێکی نوێ کاریگەریی زیاتر هەیە.
ستایشکردن تۆ ئەگەر بۆ کەسێکی ڕوخۆش یان گرژو مۆن کەمەرگیز ڕوخساریت نەدیتوە کاریگەری زیاتری هەیە. ستایشکردنی تۆ کاریگەری زیاتری هەیە ئەگەر پێش ستایشکردنەکە قسەکان بەسەرنج‌و هێزی خۆیانەوە بکەیت.
ڕونتر هەرکەسێك شایانی ستایشکردن بێت زیاتر دەرك بەدانایی‌و کارامەیی تۆ دەکات. لەقسەکانی تۆ لێکدانەوەی باشتر دەکات.
ئێستا بانمونەکانی ڕەفتاری دروست لەبواری ستایشکردنەوە بە نۆ ڕەوشی کاریگەر ئاماژە بکەین.

## ٥١

## چۆن ستایشی کەسێك بکەین

مەترسی ستایشکردن‌و پیاهەڵگوتن بۆ کەسانیتر ئەمەیە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو کەسەی ستایشی دەکەیت وابزانێ تۆ دەتەوێ بەمجۆرە قسانە بگەیتە ئامانجەکانت.

ئەم ڕاستییەکی خەماوی ستایشکردنە. ئەگەر بێتەوەی زەمینەیەکی لەبارت هەبێت لەسەرۆك، لەموشتەری یان ئازیزەکانت ستایش بکەیت. ڕەنگە ئەوان وابزانن تۆ لەبەر کارێك کەکردوتە هەستی گوناه بکەیت ئێستا بەم ستایش‌و پیاهەڵگوتنە دەتەوێ قەرەبوی بکەیتەوە. ئەمەش بزانە ستایشکردنی کەسانیتر لەحاڵەتی نەبوونی خۆیان کاریگەرییەکی بەرچاویی هەیە.

ستایشکردن بەبێ جەربەزەیی (بەنەبوونی خۆیان لەپاشەملە ئەم کارە بکە) لەجیاتی ئەوەی ڕاستەخۆ ستایشی کەسێك بکەیت. لەلای هاوڕێکانی ئەو کەسە ستایشی بکە. بۆ نمونە ئەگەر دەتەوێ سەرنجی جین نسمیت کێش بکەیت، لەجیاتی ئەوەی لەڕوی خۆیدا ستایشی بکەیت. بڕۆ بۆلای یەکێ لەهاوڕێکانی ئەو ستایشی جین بکە بڵێ:

" دەزانی جین ژنێکی گەلێك سەلارو کارایە، پێرێ لەو کۆڕەدا قسەی زۆر جوانی کرد، ڕۆژێك دێت ببێتە سەرۆکی ئەم کۆمپانیایە." دڵنیابە قسەکەی تۆ

دەگانەوە بەجێن، کاتێ هاوڕێکەی جێن دەبینێت بێگومان پێی دەڵێت:
"خۆزگە دەتزانی ئەو چەن قسەی باشی دەربارەی تۆ کرد."

## تەکنیکی ژمارە ٥١

### ستایشی پاشە ملە

ستایشێك لەپاشەملە بکرێت گەلێك کاریگەرترە لەو ستایشەی لەڕووبەڕو دەکرێت.

باشترین ڕەوشێك بۆ ستایشکردن نەتەلەفۆنە نەکورتە نامە. بەڵکو لەڕوی کەسەکەدایە. لەپاشە ملەی کەسانیتر لای هاوڕێکانیان ستایشیان بکە تاکو ئەنجامی کارت باشتر بێت.

☆ ٥٢

## کۆتری نامەبەری هەستە خۆشەکان

کـۆتره نامەبـەرەکان خـاوەنی مێژوویـەکی دێـرینن. دەڵـێن ئـەم کـۆتره نامەبەرانە تائێستا گیانی زۆر کەسیان لەمەرگ ڕزگار کردووە، دەڵێن لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا لەشەڕی ئارگۆندا یەك کۆتر گیانی ۲۰۰ کەسی لەمـەرگ ڕزگار کرد. ئەم کۆترە برینداربوو هەڵگری ئەم پەیامە بوو ئەڵمانەکان بەتەمای ئـەوەن دەوروو بەری شار بۆمباران بکەن.
ستامپی جۆ، کۆترە نامەبەرێکی دیکـە هێنـدە لەگەیانـدنی هەواڵدا سـەرکەوتوو بـوو کەسـکی ئـەویان پڕکـردەوە ئێسـتا لەمۆزەخانـەی دیتـۆن ئۆهـایۆ کەسـەر بەهێزی هەوایی میللیە لەنمایشگای بینەرانیدا دانـراوە. ملیۆنـان کـۆتری هـەواڵی خۆش‌و ئازا توانیویانە پەیامی زۆر جۆراو جۆر بگەێنن.
هەرکاتێ هەواڵێك یـان پـەیامێك دەربـارەی کەسـێك دەبیسـتیت وازی لـێ بێنـە، ناچار نیت بینوسـیت‌و کاغـەزێکی بـۆ بپێچیتەوە ببیەسـتیت بەقاچـی کـۆترێکی نامەبەرو بینرێت. بەڵام دەتوانی پەیامەکە لەبیروەریی خۆتـدا هـەڵگریت پاشان بەشـێوەیەکی ئاشـکرا بەوکەسـەی پەیوەسـتە پێـوەی بگـەێنیت.هەمیشـە گوێیەکانت بۆ هەواڵی نایاب کراوەبێت. ئەگەر کارل، یەکێ لەهاوڕێکانت لەسام، هاوڕێیەکی دیکەت ستایش دەکات ئەم ستایشە بگەێنە بەسام بڵێ کارل قسەی زۆر باشی دەربارەی تـۆ کـرد. خوشـکەکەت ستایشـی کچـی مامەکـەت دەکات، ستایشی ئەو بەکچی مامەکەت بگەێنە.

دایکت دەڵێت جۆرج چیمەنی باخەکەی بەجوانی کورت کردۆتەوە قسەکەی دایکت بگەیێنە بەجۆرج.
هەموو حەز دەکەن ئەوە ببیستن کەستایش کراوون. کاتێ تۆ هەواڵێکی خۆش دەگەیێنیت. وەرگری پەیامەکە بەئەندازەی ئەو کەسەی قسەکەی کردووە خۆشحاڵ دەبێت.

## تەکنیکی ژمارە٥٢

**کۆتری نامەبەر**

**هەواڵێکی ناخۆش بڵاو مەکەرەوە تاکو وەك کۆترێکی نامەبەری بەد دەرنەکەویت. لەجیاتی ئەوە هەواڵی خۆش بگەیێنە. هەرکاتێ هەواڵێکی خۆش دەربارەی کەسێك و وەك ستایشێك دەبیستیت ئەو قسەیە بگەیێنە.**

بێجگە لەستایش و پیاهەڵگوتنی کەسانیتر کاری دیکەش بکە.
ڕێگەیەکی دیکە بۆ گەرمکردنی دڵەکان و هاوڕێگرتن ئەمەیە ببیتە ئەو کۆترە نامەبەرەی هەواڵ بەو کەسانە دەدەن بەدڵی ئەوان بێت. بۆ کەسەکان زانیاری پێویست بەخۆیان بەڕەوشی جیاواز بنێرە.

## ٥٣

### چی بکەین ئەوان هەست بەستایشکردنی تۆ بکەن

تەنها ستایشکردن بەس نییە. ئەو کەسەی لەگەڵیدا دەدوێیت تایبەتمەندییەك بدۆزەوە. ماوەیەك لەمەوبەر چووم بۆ دیدەنی یەکێ لەهاورێ دێرینەکانم، دەمێك بوو نەمدیتبوو. کاتێ هات بۆ بردنم بۆ هۆتێل، وتی: "لیل، حاڵت چۆنە؟" پاشان سەیرێکی کردم وتی: "دیارە حاڵت زۆر باشە." هەستێکی زۆر باشم بۆ دروست بوو. مانای قسەکەی ئەو وابوو باش دەردەکەووم هەر ئەم قسەیەش حاڵی باشکردم. وریابە قسەیەك نەکەیت بەرامبەرەکەت گرژ بکەیت، ئەگەر چویتە شارێکی نوێوە تووشی کەسێك بویت لێی دەپرسیت: "ببورە، لێرە چێشتخانەیەکی باشی لێیە؟" ئەوا هەستێکی باشت بەدوێنەرەکەت داوە. بەڵام ئەگەر لەهەمان شار لەکەسێ بپرسیت: "دەتوانیت کافتریایەکی پیس و پۆخڵم لێرە نیشان بدەیت؟" دیارە قسەیەکی باشت نەکردووە. رێگەیەك بدۆزەوە لەتواناییەکانی کەسانیتر وەك پێویست ستایش بکەیت.

> ☆ **تەکنیکی ژمارە ٥٣**
>
> **ستایشکردن**
>
> **لەئاخاوتندا لەگەڵ کەسانیتر سەرنجی ئەرێنی ئەوان کێش بکەیت. وریابە ئەو قسانە مەکە مایەی دڵگرانی ئەوان بێت.**

## ٥٤

## چۆن بەستایشکردن دڵی کەسانیتر بەدەست بێنین

ڕێگەی دیکە بۆ بەدەیهێنانی هەستێکی باش لەکەسانیتردا ڕەوشێکە من
ناوم لێناوە "زمان لوسی بەڕێکەوت" بۆ نمونە ڕەنگە لەسەر مێزی ئێوارە
خوانێك دانیشیت‌و باسی گەشتی ئاسمانی بێتە کایەوە لەم کاتەدا ئەو کەسەی
لەتەنیشتەوە دانیشتووە دەڵێت:" تۆ زۆر گەنجیت، هەستانی کەشتی ئاپۆلۆ
١١ لەبیر ماوە." بێگومان ئەم قسەیە کاریگەری بەتینت لەسەر دادەنێت ڕەنگە
لەو ئاوێنەیەی لەژوری پێشوازیدا هەڵواسراوە سەیرێکی خۆت بکەیت تاکو
سەیرێکی گەنجێتی خۆت بکەیت. هاوکات ڕەنگە وەك زۆربەی خەڵکی
لەبەرواری ١١ ی ژانویە ١٩٦٩ لەبەرامبەر تەلەفزیۆندا دانیشتبیت تاکو
نیشتنەوەی ئارمسترانگ لەسەر گۆی مانگ ببینیت. بێگومان ئەو زمان
لوسیەکی ڕێکەوتی لەڕوبەڕوبونەوەی تۆدا کردووە بەڵام گرنگ نییە.

### ئاڵی بکەرەوە، ئەم کارەت پێخۆشە، ئەوانیش پێیان خۆشە

زمان لوسی بەڕێکەوت لەسەر لێوی دوێنەر بزەیەك دروست دەکات بۆنمونە
باپیرێکی تەمەن ٦٥ ساڵەی خۆت دەڵێیت: "هەرکەسێك ئەو ئامادەییەی تۆی
هەبێت دەتوانێ بەو پلانەدا سەرکەوێ بەڵام باوەڕ بکە من هەناسەم توند بوو."

یان بەهاورێیەکت دەڵێیت: "تۆ هێندە شارەزایت توانیت پەی بە ڕاستی ئەم گرێبەستە بەریت کەچی من کوێرانە واژۆم لەسەر کرد."

### ☆ تەکنیکی ژمارە ٥٤

### زمان لوسیی بەرێکەوت

ستایشی کەسانیتر بکە. لەدەستەواژەو ڕستەکانی خۆتدا وشەی ستایشگەرانە بەکار بێنە. بەڵام دوایی لێیان مەپرسە ئایا ئاگایان لەمەبەستی سەرەکی تۆ بووە. ڕەنگە زمان لوسیی بەرێکەوت هێندە کاریگەریی لەسەر ئەوان هەبوبێت کەئاگایان لەمەبەستی سەرەکی تۆ نەبوبێت.

٥٥

## کارێك بکە هەرگیز ستایشکردنی تۆ فەرامۆش نەکەن

ئایا حەز دەکەیت لەبازرگانی، هاوڕێیان و تەنانەت لەپەیوەندی عاشقانەی خۆتدا گۆڕانکاری بەدی بێنیت؟ من ڕەوشێکتان پێ دەناسێنم بەو مەجەی بەرنجی مەترسی و هۆشدارییەکانی بێ من ناوو لێناوە "ستایشی کوشندە".

ئەم ڕەوشە کاتێ فێر بووم چەن ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ هاوڕێیەکم کەناوی کرستینە لەمیوانییەك گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. هەروەك چاکەتەکەمان لەبەری خۆمان داکەند هاوڕێکەم بزەیەکی گێلانەی لەسەر لێو بوو. وتم: "حاڵت باشە، کرستین؟" "بەڵێ، باشم. دەمەوێ ئەو کەسەی پێێ وتم ددانێکی جوانم هەیە هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم"

ئەو شەوە کرستینم خستە ژێر چاودێرییەوە، بینم بەردەوام دەچێتە بەر ئاوێنە و بەچاوێکی موشتەری لەخۆی دەڕوانێت. بەڕواڵەت ئەو کەسەی ئەو قسەیەی پێ وتبوو هێندە ئەوی گوری بوو کاریگەری بەتینی لەسەر دانابوو.

بەڵام ستایش و پیاهەڵگوتنی کوشندە چییە؟ ئەم ستایشە لەسەر چۆنێتییەکی تایبەت کەبۆ کەسێك دەریدەبڕیت کاریگەری بەرینی هەیە. ستایش کوشندە لەم قسەیەدا جیاوازە کەبڵێیت کڵاوێکی جوانت هەیەیان تۆ کەسێکی باشیت. دەربڕینی یەکەم هەژێنێکی تایبەتی نییە دووەمیش شتێکی تایبەت جیاناکاتەوە. بەڵام دەربڕینی وەك جۆری مووەکانت جوانە یان تۆ خاوەنی بەسنگۆییەکی فراوانیت ئەم چۆنێتییەی تێدایە.

بەڵام ئەمجۆرە ستایشکردنە یەکەمجار دژوارە، بۆیە لەسیمینارەکانمدا ئامۆژگارییان دەکەم لەم کارەدا بەلە نەکەن. سەرەتا لەچۆنێتییەکی جەستەیی

یان کەسێتیەکی باش کەلەهاوسەرتاندا دەیدۆزنەوە سەرنج بدەن بیخەنە ئاستی ستایشو پیاهەڵگوتنەوە.

**ڕێسای بەکاربردنی ستایشکردنی کوشندە**

ئەگەر ستایشکردنی کوشندە لەجێی خۆیدا بەکار نەبەیت. دەتوانێ ئەنجامی پێچەوانە بدات بەدەستەوە.

**تەکنیکی ژمارە ٥٥**

**ستایشکردنی کوشندە**

**هەرکاتێ قسە لەگەڵ نەناسراوێکدا دەکەیت. دەتەوێ لەناوێنەدا پەیوەندی لەگەڵ ببەستیت. لەودا چۆنێتیەك یان تایبەتمەندیەك بدۆزەرەوە.**

**لەکۆتایی گفتوگۆدا سەیری چاوەکانی بکە. ناوی بێنە لەبەر ئەم چۆنێتیە ستایشی کوشندەی بکە.**

لێرەدا ئاماژەم بەچەن ئامۆژگارییەك کردووە:

یاسای ژمارە ١: ستایشی کوشندە لەتەنیاییدا بکە. ڕەنگە لەنێو کۆمەڵێکدا ستایشی کەسێك بکەیت. ئەوانیتر ئیرەیی ببەن.

یاسای ژمارە ٢: بوار بدە ستایشەکەت ڕاستیو بنەڕەتی بێت. من دەنگێکی خۆشم نییە. ئەگەر کەسێك پێم بڵێت دەنگم خۆشە ئەوا لەڕاستگۆیی ئەو دەکەوومە گومانەوە.

یاسای ژمارە ٣: دورەپەرێز بە لەستایشکردنی پاشە ملە.

## چۆن بزە بخەینە سەر لێوەکانی خەڵکی

بەپێچەوانەی ستایشی کوشندەوە. دەتوانیت سوود لەم ڕەوشانەی دیکە ببینیت. کەمن ناووم لێناوە "لاوێنەری بچوك." لاواندنەوەی بچوك دەربڕین یان وسەی لاواندنەوەی بچوکن لەمیانەی ئاخاوتنەکانی خۆتدا بەکاریان دەبەیت. بۆ نمونە لەنوسینگەی کارەکەتدا دەتوانی بڵێیت:

"جان، کارت زۆر باش بوو."

"ئافەرین مارك."

"کارەکەت خراپ نەبوو، بیلی."

لەبیرمە لەگۆڤارێکدا خوێندمەوە کیژۆڵەیەك لەماڵەوە بەدرەفتار بوو لەلایەن دایکیەوە سەرزەنشت دەکرا. دایکی لەکاتی خەوتنی خستیە سەر جێگەی نوستنەکەی‌و هاتە خوارەوە. چەن ساتێ دواتر دایك گوێی لێبوو کچەکەی دەگری. بەپەلە خۆی گەیاندە نهۆمی سەرەوەو چویە سەر کچەکەی. کچەکە بەدەم گریانەوە وتی: "دایە، من ئەمڕۆ کچێکی باش نەبووم؟"

ئەو دایکە دەڵێت: "بەم قسەیە زۆر ڕاچڵەکیم. هەرکاتێ ئەو بەدرەفتاری دەکرد بەردەوام من سەرزەنشتم دەکرد، بەلام کاتێ ویستی ڕەفتاری باشی خۆی بنوێنێت سەرنجی ڕەفتارە باشەکانی ئەووم نەدابوو وشەیەکم لەبارەی ستایشکردنەوە بەو نەوتبوو."

⭐ **تەکنیکی ژمارە ٥٦**

**لاواندنەوەی بچوك**

**بوار مەدە هاوڕێیان، خزمەکان، هاوسەرەکەت ڕۆژێك بێدەنگ پێ بڵێت: "ئایا ئەمڕۆ کەسێکی باش نەبووم؟" لێگەڕێ ئەوان دەرك بەوە بکەن تۆ لەڕەفتارە باشەکانی ئەوان پێزانین دەکەیت. ئەوان بەدەربڕینی کورتی خۆت بلاوێنەوە.**

**کارە بچوکەکان مانای فراوانیان هەیە**

لاواندنەوەی بچوك ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت. بەلام هەروەك هەموو ژنێك دەزانێت، ئەم لاواندنەوەیە بۆ کەسەکان کاریگەریی فراوانی هەیە.

کیتی کالن، دەڵێت:

لەسوچێکی ئەو ژورەوە ماچێکم بۆ بنێرە.

تەنانەت ئەگەر وانیم بڵێ کە من باشم.

کاتێ بەلامدا دەڕۆیت دەستی لاواندنەوەم بەسەردا بێنە

شتە بچوکەکان مانای گەورەیان هەیە.

بەگەرمی بزەی لێوەکانت بمبزوێنە

تاکو نیشانم بدەیت منت بیر نەچۆتەوە

بۆ هەمیشە، ئێستا، لەڕابردوو داهاتودا.

شتە بچوکەکان مانای گەورەیان هەیە.

## ستایش لەکاتی خۆیدا

یەکەمجار لەکاتی میوانییەکی نانخواردن بۆ کەسانی نەناسراو کۆڕێکم ساز کرد هەرگیز ئەو کاتەم بیر ناچێتەوە، پێشتر بەتەنیاو بۆ هاورێکەم کرستین پرۆفەی ئەم لێدوانەم کردبوو، بەڵام لەبەردەم کۆمەڵێکو بەڕاستی نۆخەکە جیاوازی دەبێت.

کاتێ بەقاچی لەرزۆکەوە هەستامە سەر پێ هەڤدە میوان چاویان تێبڕی بووم نابزانن چۆن دەدوێم. زمانم وشك بوبو، لەپی دەستەکانم ئارەقی کردبوو وەك ماسی لوسیان لێ هاتبوو. هەستم دەکرد ئەم هەڤدە کەسە وەك هەڤدە هەزار قازی بزو بیانەوێ هەڵەیەکم کرد سزام بدەن. سەیرێکی کرستینم کرد کەمنی بۆئەو یانەیە هێنابوو دەستم پێکرد: "ئێوارەتان باش، بەڕاستی مایەی دڵخۆشی منە..."

سێ خولەك دواتر لەنێو چەپڵەی ئەوانی لێیان دەترسام لەتەنیشت کرستیندا دانیشتم. نیگایەکی نائومێدانەی ئەووم کرد. بزەیەکی کرد وتی: "میوە خراپ نییە، کەمێ بخۆ." میوە؟ "میوە! چ کارێکت بەمیوە هەیە کرستین، کارەکەم چۆن بوو؟" بێدەنگ ئارامم گرت تاکو ڕای خۆیم پێ بڵێت. داوی کەمێك پێی زانم خۆیو ئامادەبوان چێژێکی فراوانیان لەقسەکانم بینیوە. پێویستی بەپیاهەڵگوتنو ستایش نەدەکرد.

**دەبێت لەئێستاوە پیاهەڵگوتن‌و ستایش بكەیت**

كاتێ پزیشـك بەچەكوشـەكەی زەبرێـك لەئـەژنۆی تـۆ دەدات، دەسـبەجێ ئەژنۆكانت كاردانـەوە دەنـوێنن، كەسـانێتر كاتێ ڕەفتـارێكی نایاب دەنـوێنن. دەسبەجێ دەبێت دەسخۆشیان لێبكەیت. "جوان بوو." كەسەكان ڕەنگە كاری نایاب‌و سەكەوتوانە ئەنجام بدەن. خواردنێكی بەتام ئامادە بكەن. گرنگ نییە چی دەكەن ئەگەر كارەكەیان نایابە. دەسبەجێ دەسخۆشییان لێبكە. كەسێ كارێكی جوان دەكات دەسبەجێ دەیەوێ مایەی ستایش كردن بێت.

**تەكنیكی ژمارە ٥٧**

**ستایش لەكاتی خۆیدا**

**بەخێرایی چاولێك نانێك، لەبەر ئەوەی كەسانێتر كارێكی جوان بكەن، ستایش‌و دەسخۆشییان لێبكە. "جوان بویت."**

**خەمی ئەوەت نەبێ بڕوا بەقسەكەت نەكەن. قسەكەی تۆ كاریگەری خۆی دەكات.**

**ئەگەر خراپەیەك بكەن چی؟**

ڕەنگە بپرسیت: "ئایا چاوەڕوان دەكەیت درۆ بكەم؟" بەڵێ، ئەمە یەكێكە لەو دەگمەنانەی درۆكردن عەیب نییە. دەربارەی ستایشكردن‌و دەسخۆشی زۆرمان باس كرد. ئێستا بابچینە سەر بابەتێك بەلای زۆر كەسەوە دژوارە.

## چی بکەین ستایشمان بکەن

ئێمە هەڵەیەکی گەورەمان هەیە. نازانین چۆن مایەی ستایش بین.
سەیرێکی ئەم دیمەنە بکە:
پیاو: (بەبزەیەکەوە) "جلێکی جوانت پۆشیوە."
ژن: (ڕوگرژ دەکات) "ئەم جلە کۆنانە دەڵێیت؟"
پیاو: (بیرێك دەکاتەوە) "وابزانم ئەم قسەیەی منت پێ خۆش نەبوو. دیارە وادەزانی من سەلیقەیەکی خراپم هەیە. باشترە چیتر قسە نەکەم."
سێ هەفتە دواتر...
ژن: "خۆ ستایشێکی نەکردم."
پیاو: "بۆچی، ناخۆشە؟"
"کچان چ شتێکیان پێخۆش نییە؟"
ماوەیەك لەمەوبەر لەیەکێ لەسیمینارەکانمدا، کۆمەڵێك باسی ستایش و پیاهەڵگوتنیان دەکرد. کەسێك لەئامادەبوان وتی: "کچان حەز ناکەن ستایش بکرێن."
من وتم: "کچان حەزیان لەچی نییە؟"
ئەو وتی: "ڕۆژێك ستایشی کچێکم کرد ئەو وتی: دیاری کوێریت کەباش نابینیت."

ڕاستی ئەمەیە زۆربەی ئەو کەسانەی ستایشیان دەکەیت سوپاست دەکەن یان شەرم دەکەن یان دەڵێن: "داوای لێبوردن دەکەم، وانییە، تۆ ڕێزت هەیە."

**تەکنیکی ژمارە ٥٨**

**سوپاسگوزاربە**

**کاتێ کەسێك ستایشت دەکات، یان قسەیەکی ستایش ئامێزت پێدەڵێت. سوپاسی بکە تاکو ستایشەکە بۆ خۆی بگەڕێتەوە.**

## چی بکەین هاوسەرەکەمان ئێمە بەهاوسەی هەموو تەمەنی خۆی بزانێت

بێگومان تۆش ئەوەت بیرە کاتێ منداڵ بویت هاوڕێیانی دایكو باوکت لێی دەپرسیت: "کاتێ گەورە بویت دەتەوێ ببیت بەچی؟" دیارە هەرکەسەو لەمبارەیەوە وەڵامێکی تایبەتی خۆی هەیە.

هەموو خۆمان بەکەسێکی تایبەت دەزانین پێمان وایە دنیا بەهای ڕاستەقینەی ئێمەی نەپێکاوە.

بەڵام ستایشکردنی کەسێك کەدەیناسیتو خۆشت دەوێت پێویستی بەکارامەیی تایبەت هەیە، بۆ ئەوەی کەسێکی خۆشەویست زیاتر لەخۆت نزیك بکەیتەوە من ڕەوشێکم داهێناوە ناووم ناوە "یاری کێلی گۆڕ" ئەم یارییە چەن قۆناغێکی هەیە.

قۆناغی یەکەم:

لەکاتێکدا ئارامو بێدەنگ لەگەڵ هاوڕێ، یان هاوسەر، یان هاوبەشێکی بازرگانی خۆتدا قەسە دەکەیت بڵێ دوێنێ بابەتێکت دەربارەی بەردی گۆڕ خوێندەوە. باسەکە بەمجۆرە بوو خەڵکی دەیانەوێ چ شتێك لەسەر گڵکۆی گۆڕەکەیان بنوسرێت. تۆ دەزانیت خەڵکی حەز دەکەن چۆنێتیەك کەزیاتر لەهەموو شتێکی دیکە کەشانازی پێوە دەکەن لەسەر کێلی گۆڕەکەیان بنوسرێت. پاشان بڵێ خواستی هەمەجۆری خەڵکی بەرچاو دەکەوێ. بۆ نمونە:

- لێرەدا جان، نێژراوە ئەو کەسێکی دانیشمەندی بەرز بوو.
- لێرە دایان ئسمیت نێژراوە. ئەو ژنێکی میهرەبان و دڵنەرم بوو.
- لێرە بیلیی باکس نوستووە. ئەو کەسێك بوو دەیتوانی بەئاسانی خەڵکی بخاتە پێکەنین.
- لێرە جین ویلسۆن نێژراوە. ئەو بۆ هەر جێیەك دەچوو چالاکی لەگەڵ خۆی دەبرد.

**قۆناغی دووەم:**

بەهاوسەری ژیانتان بڵێن حەز دەکات چ شتێك لەسەر کێلی گۆڕەکەی بنوسرێت. بەجدی قسە بکە. هانی بدە دەبارەی خۆی تێڕوانینی هەبێت.

**قۆناغی سێیەم:**

ئێستا بپرسە: "دەزانی جۆ، دوای هەموو ئەم قسانە. زیاتر بەچ شتێکی خۆتەوە شانازی دەکەیت؟ حەز دەکەیت خەڵکی چ بیروەریەکیان دەربارەی تۆ هەبێت؟ حەز دەکەیت خەڵکی چ نوسراوێکی سەر کێلی گۆڕەکەت بخوێننەوە؟"

ڕەنگە هاوبەشی کارو پیشەکەت، جۆ، بڵێت: "حەز دەکەم خەڵکی بزانن من بەها بەبەڵێنەکانم دەدەم." بەدیقەتەوە گوێ بۆ قسەکانی بگرە.

**قۆناغی چوارەم:**

لێگەڕێ لانیکەم سێ هەفتە تێپەڕێت، پاشان هەرکاتێ ویستت پەیوەندیتان باشتر بێت. ئەو قسەیەی پێشتر دەربارەی دەستەواژەی سەر کێلی گۆڕەکەی وتبوی پێی بڵێرەوە. بڵێ: "دەزانی، من لەوەی لەگەڵ تۆدا بازرگانی دەکەم خۆشحاڵم چونکە تۆ پابەندیت بەقسەی خۆتەوە."

جۆ، دەگاتە ئەم ئاكامەی: "سەرەنجام كەسێك منی بەوشێوەیەی خۆم ناسی." ستایش‌و پیاهەڵگوتنی جۆ لەسەر ئەو كاریگەرییەكی بەتینی هەیە.

### تەكنیكی ژمارە ٥٩

**كێلی گۆڕ**

لەكەسانی گرنگ‌و بەنرخی ژیانت بپرسە حەز دەكەن چ بابەتێك لەسەر كێلی گۆڕەكەیان بنوسرێت. وەڵامەكەیان لەیادگەی خۆتدا بپارێزە. پاشان وەختێ كاتی گونجاو هاتە پێشەوە، پێی بڵێ: "خۆشم دەوێی..." پاشان خواستەكەی خۆت بەو بڵێ.

بەم ستایشكردنە خەڵكیی زۆر بەتین خۆشحاڵ دەكەیت.

وریابە دەبڕینی كەسانی جۆراو جۆرتەنها دەربارەی خودی خۆیان دەتوانیت بەكاربەریت.

رتنی ئەوەی ئەوانت خۆشدەوێت بەلای ئەوانەوە گەلێك خۆشە.

## بەشی حەوت

# چۆن کار لەدڵەکان بکەین

سەدان کەس تاکو ئێستا بێئەوەی تۆیان بینیبێت، بەتەلەفۆن قسەیان لەگەڵ کردویت. ئەوان نەگرژو مۆنی تۆیان بینیوە نەخەندەو پێکەنینەکانت، ئەوان هەرگیز دەستیان بەر تۆ نەکەوتووە، هەرگیز زمانی جەستەی تۆیان نەخوێندوە نەیاندیتوە چۆن خۆت دەگۆڕیت. ئەوەی بیستوتە ڕەنگە لەفاسیلەیەکی چەن سەد میلیەوە بێت. بەڵام ئەوان هەست بەوە دەکەن ڕێك بەپێی دەنگەکەی تۆ دەتناسن. تەلەفۆن خاوەنی هێزێکی سەیرە.

سەیرە، بەڵام هەمیشە وردو دروست نییە. من لەگەڵ ئاژانسی گەشتیاریم ساڵانێك تەنها پەیوەندی تەلەفۆنیم هەبوو، بەڵام شێوەی بەد ئاخاوتنی کارمەندی ئەم ئاژانسە بوو بەهۆی ئەوەی چەندیجار بیر لەوە بکەمەوە ئاژانسی گەشتەکانم بگۆڕم.

چەن ساڵێك بەر لەئێستا ڕۆژێکی دوو شەممە هەواڵێکی ناخۆشم بیستو ناچار بووم بۆ گەڕانەوەم بۆ شارەکەم بلیت ئامادە بکەم. دەرفەتێکم نەبوو لەفرگەو ڕیزدا بوەستم، تاکسیەکم گرت پێم وت بەرامبەر ئاژانسی گەشتیاری بوەستێت تاکو بلیتو کارتی سواربوونی فرۆکە وەرگرم.

بۆ یەکەمجار بوو بچمە ئاژانسەوە، ژنێك لەدیو یەکێ لەمێزەکانەو دانیشتبوو بەدیتنی من بەپەلە لەجێی خۆی هەستا، بزەیەکی کرد وتی دەتوانێ چیم بۆ

بکات. کاتێ پێم وت دەستبەجێ دەستبەکار بوو، کاتێ بلیتەکانی بۆ دەرکردم بەخۆم وت: "چەن ژنێکی نایابە."

چەن سانێك دواتر کەبلیەتەکانی پێدام، لێم پرسی: "ناووت چییە؟"

وتی: "لیل، من رانیم." پاشان بەزەردەخەنەیەك هیوای گەشتێکی خۆشی بۆ خواستم. سەرم سوڕمابوو. چۆن پێشتر وامدەزانی کەسێکی نایاب نییە؟ رانی، کەلێك خانم و میهرەبان بوو.

کاتێ بەتاکسی بەرەو فڕگە دەڕۆشتم چوومە قوڵایی بیرکردنەوە. ئەم رەفتارەی رانی هەرگیز لەڕێی سیمی تەلەفۆنەوە نەدەگوێزرایەوە، چاووم نوقاندو هەوڵمدا ئەو دەنگەی پێشتر بیستبووم لەزەینمدا زیندوی بکەمەوە. بەڵێ، رانی هەمان ئەو فرۆشیارە بوو پێشتر ڕقم لێی بوو. بەڵام ئیستا کەزمانی جەستەی ئەووم بینی، بۆچوونم بەرامبەری گۆڕا. وابزانە ئەمە ئەو بابەتەیە بەلای ئێوەشەوە ڕاستێنراوە. دە تەکنیکی دواتر کۆمەکتان دەکات تاکو گفتوگۆی تەلەفۆنی باشترتان هەبێت.

٦٠

## چی بکەین لەگفتوگۆی تەلەفۆنیدا نایابتر دەرکەوین

هاوڕێیەکم هەیە بەناوی تینا، کەبۆ یەکێ لەبەرنامەکانی دەرەوەی "برادوەی" جلو پۆشاك ئامادە دەکات. ئەم بەرنامەیە پێگەیەکی بەرچاوی هەیە. ئاستی سەرکەوتنی گەشتە ئەوەی شانۆ لەبرادوەی نمایش بکەن. بەڵام لەبرادوەیدا ئەم بەرنامەیە پیشوازی لێنەکرا.
کاتێ هەواڵی ناخۆشم دەربارەی ئەم بەرنامەیە خوێندەوە، تەلەفۆنم بۆ تینا کردو هۆکاری ناکامی بەرنامەکەم پرسی. تینا وتی دەرهێنەرەکان نەیانتوانی ئەکتەرەکان قایل بکەن تاکو ڕۆڵی خۆیان بەشێوەیەك بگۆڕن بەرنامەکە لەبرادوەیدا هەواداری هەبێت. ئامۆژگارییەکان تەواو بەئەکتەرەکان کۆتایی نایەت، ئەگەر ڕوخساری تۆ لەسەر پەردەی نمایش بەڕوونی نیشان بدرێ دەتوانی بەیەك چاوتروکاندن پەیامەکەتان بگەیێنن. بەڵام لەڕادیۆ ئەم کارە بێ مانایە چونکە بیسەران چاوتروکان یان چاو نوقانی تۆ نابینن.
زمانی جەستەو حاڵەتی ڕوخسار زیاتر لەنیوەی کەسێتی تۆ پێك دێنێت، کاتێ کەسەکان تۆ نابینن. ڕەنگە لێکدانەوەی تەواو هەڵە لەسەر تۆ بکەن. هەمان ئەو لێکدانەوەیەی کەمن لەسەر ڕانی کارمەندی ئاژانسی گەشتیاری هەمبوو. بۆ ئەوەی بتوانی کەسێتی خۆت لەڕێی تەلەفۆنەوە دەربخەیت. دەبێت بتوانیت هەستەکانت بگۆڕیت بەدەنگ. هاوکات دەبێت تۆکمەترو گەرمتر بدوێیت چونکە

٢٠٪ وزە لەتەلەفۆندا دەفەوتێت. گریمان بڕیارە سبەی چاوت بەموستەرییەکی نوێ بکەویت. کاتێ یەکتر دەناسن تەوقەی لەگەڵ دەکەیت. سەیری ڕوخساری دەکەیت. بەکەوتنێکی چاوی لەگەڵدا دروست دەکەیت، بزەیەکی گەش لەسەر لێوەکانت دروست دەکەیت. بەوردی گوێ بۆ قسەکانی دەگریت، ئەو تۆی زۆر خۆش دەوێت. بەڵام ئەگەر بڕیار بێت تەلەفۆنی پێکەوە قسە بکەن چی ڕوی دەدا، ئەگەر یەکتریتان نەدیتبایە ناچار دەبویت بەقسەکانت تێڕوانینی خۆت دەربڕیت من ئەم ڕەوشەم ناو ناوە
"دیامانی گفتوگۆ".

ئەگەر بەرکەوتنی چاویی بوونی نەبێت، واتا ئەگەر بەچاو نەبینرێت، بەکاربردنی وشەی وەک"ئێ"، "وایە"، "جوانە"، "کاڵتە دەکەیت"، "زیاتر ڕونی بکەرەوە" ئاخاوتنی خۆت گەرمتر بکە.

☆ تەکنیکی ژمارە ٦٠

**دیامانی گفتوگۆ**

هەرکاتێ تەلەفۆن هەڵدەگریت خۆت وەک ئەکتەرێك ببینە. دەبێت بتوانیت بزەکانت لەقاڵبی وشەدا نیشان بدەیت. لەجیاتی سەرداخستن، سوود لەدەنگ ببینە، دەبێت کارێك بکەیت گوێگر حاڵەتی تۆ ببیستێت. دەبێت شەرحی حاڵی خۆت بەوشەکان بکەیت. دەبێت٣٠٪ بڵندترو بەوزەتر بدوێیت!

٦١

## چۆن نزیك دەرکەویت

کاتێ ڕوبەڕوی یەکتریی لەسەر مێزێك دانانیشن، دەبێت جێگرەوەیەك بۆ هاودڵیی پەیدا بکەیت. چۆن بتوانیت لەکاتێکدا سەدان کیلۆمەتر لەیەکترەوە دورن هاودڵیو نزیکیی بەدی بێنیت؟ چۆن بتوانیت هەستی تایبەت بوون بدەیت بەکەسێك تەلەفۆنیی قسەی لەگەڵ دەکەیت. وەڵام ئاسانە. ناوی ئەو کەسەی چەنجارێك دوبارە بکەرەوە. لەڕاستیدا قسەکردنی خۆت بەناوی ئەو بۆمباران دەکەیت. کاتێ کەسی بەرامبەر ناوی خۆی لەزمانی تۆوە دەبیستێت زۆر خۆشحاڵ دەبێت. "سوپاست دەکەم، سام." "باشترە ئەم کارە بکەین.بتی." "بۆچی نا، دیمیتری."

"کتی، من لەقسەکردن لەگەڵ تۆدا چێژ دەبینم."

بردنی ناوی کەسی بەرامبەر لەمیانەی ئاخاوتنێکی ڕو بەڕودا دەسەلاتخوازانە دەردەکەویت. بەڵام لەگفتوگۆی تەلەفۆنیدا بەوجۆرە نییە. ئەگەر کەسێك ناوی تۆ بێنێت، گوێ بۆ قسەکانی بگرە. ئەگەر گوێگرەکەت ئاگای لەقسەکانت نەبێت بەبیستنی ناوی خۆی دێتەوە سەرخۆ.

> **تەکنیکی ژمارە ٦١**
>
> **ناوبردن بەدوبارەکردنەوە**
>
> کاتێ کەسەکان ناوی خۆیان دەبیستن. حەواسیان دێتەوە سەرخۆ، کاتێ گفتوگۆی تەلەفۆنی ناوی کەسەکە چەنجارێك دوبارە بکەرەوە.
>
> لەگفتوگۆی ڕوبەڕودا دوبارەکردنەوەی ناوی کەسەکە ڕەنگە دەسەلاتخوازانە دەرکەوێت، بەڵام لەگفتوگۆی تەلەفۆنیدا ئەم کارە بەسوودی تۆ تەواو دەبێت.

## چی بكەیت تەلەفۆنت بۆ بكەن خۆشحاڵ بیت

پسپۆڕان دەڵێن لەهەر شوێنێك بیت تەلەفۆنەكەت لێبدات، سەرەتا بزەیەك بكەو پاشان وەڵام بدەرەوە. هەندێك دەڵێن باشترە لای تەلەفۆنەكەوە ئاوێنەیەك دانێیت لەكاتی گفتوگۆی تەلەفۆنی وێنەی خۆت لەئاوێنەكەدا ببینیت ئاگو ئاگات لەبزەكانت بێت. كەسانی سەركەوتوو پێش ئەوەی وەڵامی تەلەفۆن بدەنەوە بزە ناكەن. ئەوان كاتێ زانیان لەگەڵ كێ قسە دەكەن زەردەخەنە لەگەڵ دەنگی خۆیان دەگونجێنن. لێرەدایە زەدەخەنە وەڵام دەداتەوە. وەڵامی تەلەفۆن بەشێوەیەكی پیشەیی بدەروە، ناوی خۆت یان هاوبەشەكەت بێنە پاشان كاتێ زانیت لەگەڵ كێدا قسە دەكەیت لێگەڕێ خەندەیەكی گەش هەموو ڕوخسارت داگیر بكات.

"ئاه جۆ، (زەردەخەنە) چەندە لەبیستنی دەنگت چەن خۆشحاڵم". "سالی، (زەردەخەنە) حاڵت چۆنە؟" "بیل، (زەردەخەنە) هیوادارم ئەم تەلەفۆنە تۆ بێت." هاوڕێیەكم هەیە بەناوی ستیڤ، لەواشینگتۆن سەرۆكی كۆمپانیایەكی گەورەیە. هەركاتێ تەلەفۆنی بۆ دەكەم نازانم كام لەهاوكارەكانی ئەو وەڵامم دەداتەوە، بەڵام وەڵامدانەوەی ئەوان یەكسانە. سەرەتا ناوی كۆمپانیاكەیان دەبەن، دواتر ناوی خۆیان، دواجار دەپرسن دەمەوێ لەگەڵ كێ قسە بكەم. دوای ئەوەی خۆم دەناسێنمو دەڵێم دەمەوێ لەگەڵ كێدا قسە بكەم، ئەو دەسبەجێ دەڵێت: "بەڵێ، تكا دەكەم ئێستا پەیوەندییەكە گرێ دەدەم."

پارساڵ چووم بۆ واشینگتۆن، چاووم بە ستیڤ كەوتو لەوەی كارمەندەكانی بەچاكی وەڵامی تەلەفۆنەكان دەدەنەوە ستایشی خۆیی و كارمەندەكانیم كرد.

ستیڤ پێی وتم هەرکەس تەلەفۆن بۆ کۆمپانیاکەی ئەو بکات بەوجۆرە وەڵامی دەدرێتەوە.

کاتێ نەناسراوێك زەنگ لێدەدات:

بەستیڤم وت: "ئەگەر نەناسراوێك زەنگ لێبدات چی؟ بۆنمونە هاوکارەکانت خۆیان بەو کەسە نەناسێنن."

"من لەم بارەیەوە داوام لەکارمەندان کردووە بەئامازە بۆ زەنگێك رویەکی خۆشیان هەبێت. بۆ نمونە ڕەنگە بەڕێز ئیسمیت زەنگ لێبدات ئەندامێکی جڤاتی ئێمەی بوێت. کەسێك وەڵامی تەلەفۆنەکە دەداتەوە دەسبەجێ دەڵێت: "بەڵێ، تکا دەکەم هەر ئیستا پەیوەندییەکە گرێدەدەم بەبەرپرسی ئەو کارەوە." وتم: "زۆر باشە، گریمان ئەو کەسەی تولەفۆن دەکات فرۆشیارێکەو دەیەوێ تاقمێکی مۆبیلاتی ئیداری بەئێوە بفرۆشێت."

"جیاوازیی نییە. کاتێ یەکێ لەهاوکارانی من تەلەفۆن هەڵدەگرێت بەو کەسە بەپێێ ئەو ڕەوشەی پێشتر باسم کرد وەڵام دەداتەوە. بەم جۆرە هەڵسوکەوتە ئەگەر بمانەوێ کەلوپەلێك لەفرۆشیارێك بکڕین کارمان ئاسانتر دەبێت.

☆ تەکنیکی ژمارە ٦٢

**ئاه، چەن نایابە، تۆیت؟**

بە دیدی "من هەمیشە خۆشحاڵم" وەڵامی تەلەفۆنەکان بدەرەوە. گەرمو پیشەیی وەڵام بدەرەوە. پاشان کاتێ زانیت لەگەڵ کێدا قسە دەکەیت. لێگەڕێ باخۆشحاڵی هەموو ڕوخسارت داپۆشێت. لێگەڕێ هەستی چالاکی لەقسەکانتدا دەرکەوێت.

## گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی دژوار

تەلەفۆن بۆ شوێنێك دەکەیت بەڕێتمێکی جوان دەڵێیت:" دەکرێت لەگەڵ بەڕێز جۆنز قسە بکەم؟" دەنگێکی زبرو ناخۆش دەڵێت: "تۆ کێیت؟" ناوی خۆش هێندە ناسراو نییە ئەو دەسبەجێ پەیوەندییەکە گرێبدات بەبەڕێز جۆنزەوە.

ئەو کەسەی وەڵامی داوەتەوە دەڵێت: "لەکام کۆمپانیاوە زەنگت لێداوە؟" تۆ ناوی ئەو کۆمپانیایەی پێ دەڵێیت کەکاری تێدا دەکەیت هیوادریت ناوی کۆمپانیاکە بەس بێت. بەڵام ئەو بەو ئاسانییە دەسبەردار نابێت: "دەربارەی چ شتێك دەتەوێ قسە بکەیت؟"

چەندین هەفتە دوای نانخواردن لەگەڵ ستیڤ جارێکیتر دەرفەتی ئەوەم هەبوو تەلەفۆنی بۆ بکەم. "من لیل لاندزم. دەتوانم لەگەڵ بەڕێز ستیڤ قسە بکەم؟" "بەڵێ، بێگومان. مۆڵەت بدە پەیوەندییەکە گرێ بدەم." چاوەڕێ دەکەم ستیڤ تەلەفۆنەکە هەڵگرێت. بەڵام ساتێ دواتر هاوکارەکەی ستیڤ دوبارە تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێتەوە:" گەلێك بەداخەوە خانم لاندس. ستیڤ تۆزێك پێش ئێستا چووە بۆ نانخواردن. دڵنیام فرسەتی قسەکردنی لەگەڵ ئێوەوە فەوتاندووە." لەتەواوی ئەم ماوەیە بزەیەك لەسەر لێوەکانی من وەستاوون. بیر دەکەمەوە ئایا ئەو نەیوست لەگەڵ مندا قسە بکات؟ تۆ بڵێی سەری جەنجاڵ بێت؟ تۆ بڵێی بۆ نانخواردن نەچووبێت؟ هەرگیز.

## تەکنیکی ژمارە ٦٣

**گفتوگۆ**

**ئەگـــەر دەتـــەوێ هەڵبـــژێریت لەگـــەڵ کێـــدا قســـە دەکـــەیت. بەسکرتێرەکەت بڵێ، یەکەمجار بڵێت: "بەڵێ، پەیوەندییەکە گرێ دەدەم. دەکرێت بەو بڵێم کێ لەپەیوەندیدایە؟ ئەگەر ئەو پێشتر خۆی ناساند، ناوی دوبارە بکەرەوە بڵێ: بەڵێ، بێگومان خانم جانسۆن، هەر ئێستا پەیوەندییەکە گرێ دەدەم."**

**لەم کاتەدا کاتێ سکرتێرەکە دوبارە قسە دەکاتەوەو دەڵێت بەڕێز براون لەژوری خۆی نییە. مەسەلەکە بەگران مەگرە.**

٦٤

## چۆن لەڕێی تەلەفۆنەوە بەخواستەکانت بگەیت

بابەتێك دەربارەی کەسێکی ناسراو دەزانم خاوەنی هۆتێلە زنجیرەییەکانی وڵاتە جیاوازەکانە. ئەم کەسە لێرەدا ناوی دەنێم ئید، هەموو ساڵێك هەزاران کەس دادەمەزرێنێت یان دەریان دەکات، قەرز لەدامەزراوە مەزنەکان دەکات و کۆمەکی خێرخوازانەش بەدامەزراوە خێرخوازییەکان دەکات. ناوی ئید، لەپیشەی هۆتێلداریدا گەلێك بەناوە ئەو کرۆکی پلانی هەموو پێکهاتەکانی خۆیەتی، من لەگەڵ هاوسەرەکەی ئەو کەناوی سیلڤیایە هاوڕێم بۆ پێکهاتەی مێردەکەی کاری ڕاوێژکاری دەکەم. ڕۆژێك سیلڤیا بۆ چاخواردنەوەیەك دەعوەتی کردم پاشان بەداوای لێبوردنەوە لەوەیکە ڕۆژی پشوو خەریکی کاروباری ماڵە وتی کارەکان دەبێت خۆمان بیکەین لەکاتێکدا دانیشتبوین زەنگی تەلەفۆن لێدرا. سیلڤیا داوای لێبوردنی کرد تاکو وەڵامی تەلەفۆنەکە بداتەوە.

گوێم لێ بوو وتی: "نا، بەداخەوە ئەو لەماڵەوە نییە. دەتوانم بەو بڵێم کێ تەلەفۆنی کردووە؟...نا، نازانم کەی دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر خۆتان بناسێنن... نا، وتم نازانم ئەو کەی دەگەڕێتەوە... بەڵێ، پێی دەڵێم تۆ تەلەفۆنت کردووە."

کاتێ سیلڤیا هاتەوە بۆ لای من دیار بوو ناڕەحەت بووە، من کەمەسەلەی پەیوەندی تەلەفۆنی هەمیشە بەلامەوە مایەی سەرنجە نیگایەکی

پرسیارکەرانەم هەبوو. سیلڤیا کەئاگای لەبزێوییەکەی من بوو وتی: "ئەم دەبەنگە وادەزانێ دەتوانێ پارەی لێ وەربگرێت." پاشان پێکەنێ، حالەتی ئەو زیاتر هانیدام بۆ پرسیارکردن. دیار بوو ئەو یەکێك بوو لەوکارمەندە بەرپرسی کۆکردنەوەی کۆمەکی خێروازی بوو. "ئەو لەماوەی دوو هەفتە پێش ئەوەی ئێج لەوێ بێت دوبارە تەلەفۆنی کردەوە. بەڵام تەنها جارێك سڵاوی لەمن نەکرد. هەواڵی نەپرسیم. بەهۆی ئەو ئەرکەی کێشاومە داوای لێبوردنی نەکرد." ئەمەش سیلڤیای نارازی کردبوو. خاڵی گرنگ، کاتێ تەلەفۆن بۆ ماڵی کەسێك دەکەیت. سڵاو لەهاوسەرەکەی بکە، کاتێ تەلەفۆن بۆ ئیدارەیەك دەکەیت، حاڵو هەوای سکرتێرێکت هەبێت.

**☆ تەکنیکی ژمارە ٦٤**

**سڵاو بکە**

**هەرکاتێ تەلەفۆن بۆ ماڵی کەسێك دەکەیت، ئەو کەسەی وەڵامت دەداتەوە سڵاوو هەواڵپرسیی لێبکە، هەرکاتێ زیاتر لەیك دووجار تەلەفۆن بۆ ئیدارەکەی دەکەیت لەگەڵ سکرتێرەکەیدا ببە بەهاورێ: کەسێك کەهێندە لەکەسێکی پایەبەرزەوە نزیکەو لەجیاتی ئەو وەڵامی تەلەفۆن دەداتەوە، خاوەنی ئەو هێزەیە تاکو کاریگەریی لەسەری هەبێت.**

٦٥

## چۆن ئەوەی دەتەوێ مسۆگەری بکەیت
## رەچاوکردنی کاتی گونجاو

کاتێ ئەلیکساندر گراهام بێل تەلەفۆنی داهێنا. ئەوو هاوکارەکانی بۆ دەستەواژەی وەک "سڵاو چۆنیت؟" پستەیەکیان نەبوو. یەکەم وشەیەک لەو سەردەمەدا دەریان دەبڕی ئەمە بوو: "ئایا دەتوانی قسە بکەیت؟" دیارە بیلو هاوکارانی بەتواناییی هونەریی ئاماژەیان هەبوو. بەڵام ئەمڕۆ : "ئایا دەتوانی قسە بکەیت؟" پێش ئەوەی دوو کەس پێکەوە بدوێن بەم مانایەیە: "کاتی گونجاوە بۆ قسە کردن" ئایا یەک خولەک دەرفەتت هەیە لەمبارەیەوە قسە بکەین؟"

هەرکاتێ تەلەفۆن بۆ ماڵی کەسێك دەکەیت. نازانیت کەسی مەبەستی تۆ لەچ دۆخێکدایە، ئایا خەوتووە یان تەباخی چێشت لێنانەکە گرێ گرتووە. کاتێ تەلەفۆن بۆ کەسێك دەکەیت لەشوێنکاری خۆیەتی، تۆ نازانیت ڕەنگە ئەو تەنها دوو کاتژمێر دەرفەتی هەبێت گوزارشێك تەواو بکات.بۆیە کەتەلەفۆن بۆ هەرکەسێك دەکەیت دەبارەی گونجاویی کات پرسو جۆیەك بکە.

"سڵاو جۆ، کاتی گونجاوە بۆ قسەکردن؟"

سڵاو سوزان، دەتوانم یەك خولەك لەکاتت بگرم؟"

"سام، بواری ئەوەت هەیە لەماوەی یەك خولەکدا بۆت ڕوون بکەمەوە ئەمڕۆ چ کێشەیەکم تووش بوو؟"

فرۆشیارن چاوەڕوانی چرای سەوزن
ئەم خاڵە بۆ فرۆشیاران. ئەگەر لەکەسێك بپرسیت کاتی ئەوەی هەیە تۆ دەربارەی فرۆشتنی کاڵایەك قسەی لەگەڵ بکەیت و ئەو دەڵێت: "نا، کاتم نییە، ئیستا ئەو شتەی دەتەوێ بیفرۆشیت چییە؟" لەگەڵ ئەودا قسەی فرۆشتن مەکە، کاتێ ئەو لەحاڵەتی چرای سەوزدایە قسەی لەگەڵ مەکە.

☆ تەکنیکی ژمارە ٦٥

**کاتی تۆ چ ڕەنگێکە؟**

بێ گوێدانە ئەوەیکە دەزانیت چەندە قسەکردنت پێویستە. هەمیشە دەربارەی گونجاویی کات پرسیار لەکەسی بەرامبەر بکە. هەمیشە بڵێ: " ئایا دەرفەتی چەن وشەیەك قسەکردنی هەیە؟" کاتێ بۆ قسەکردن کاتی گونجاو هەبوو هەرگیز وەڵامی "نا" وەرناگریتەوە.

## ٦٦

## چۆن بەئامێری پەیامگر هەمووان بخەیتە ژێر کاریگەرییەوە

بەسەرنجدان لەو پەیامانەی کەسەکان لەئامێری پەیامگری تەلەفۆندا بەجێی دەهێڵن. دەتوانیت دەربارەی ئەوان زانیاری تەواوت هەبێت. ڕەنگە تەلەفۆن بۆ کەسێك بکەیت تەلەفۆنەکەی وەڵام بداتەوە: "ئێستا لەشوێنکاری خۆم نیم. بەڵام ئەمدەزانی تۆ دەتەوێ پەیوەندیم پێوە بکەیت." ئایا وانازانیت ئەم کەسە گرێیەکی گێلیی هەبێت؟

ڕەنگە تەلەفۆن بۆ کەسێك بکەیت پەیامگری تەلەفۆنەکە بڵێت: "ئێستا لەماڵەوە نیم بەڵام ئەو دەنگەی دەیبیستیت دەنگی سەگێکی دوبرمەنە. تکایە پەیامێك بەجێ بێڵە." ئایا نازانیت ئەم خانمە لەوە دەترسێت کەلەماڵ نەبێت کەسێك دەست بۆ ماڵەکەی بەرێت؟ بەڵام زۆربەی پەیامو نیگەرانیەکانی خۆمان بەمجۆرە دەرنابرین.

لێرەدا خاڵێك وەکو ڕێنمایی دەردەبرم. هەموو ڕۆژێك ئەو پەیامەی پەخشی دەکەیت بیگۆڕە. کەسەکان هەستی ئەوە دەکەن کاتێ تۆ دەستەواژەیەکی جیاوازت تۆمار کردووە ڕووبەڕوی دەبنەوە زیاتر دەتوانن متمانەت پێبکەن، ئەگەر بۆتکرا ئەو کەسانەی زەنگت بۆ لێدەدەن ئاگاداریان بکەرەوە تۆ لەکوێیت لەچ کاتێکدا دەگەڕێتەوە . ئەگەر مورشتەریت هەیەو دەتەوێ کارێکیان بۆ بکەیت ئەم ڕەوشە زۆر بەسوودە. بۆ نمونە دەتوانیت ئەم پەیامە تۆمار بکەیت: "من...(ناوی خۆت) م ئەمڕۆ سێشەممە ٧ی ئۆگستۆسە، تا کاتژمێر

پێنجی دوانیوەڕۆ دەبێت بەشداری كۆڕێكی فرۆشیاری بكەم، تكایە پەیامێك بەجێ بێڵە. هەر كەگەڕامەوە پەیوەندیت پێوە دەكەم."

بزانە دەبێت پەیامەكەت كورت بێت . هەندێكەس ڕۆژانە پەیامەكانیان دەگۆڕن. بەڵام پەیامەكەیان ئاشكرایە.هەندێكەسی ئەم سەردەمە ئەم پەیامە بەكار دەبەن: "من لەوێ نیم، یان بەتەلەفۆنێكی دیكە قسە دەكەم. تكایە پەیامێك بەجێ بێڵە تاكو لەزوترین كاتدا وەڵامت بدەمەوە."بزانە پەیام كاریگەریی بەتینی هەیە لەسەر كەسەكان، هەوڵبدە ڕیتمێكی دۆستانەو بێ لایەنیت هەبێت. پەیامەكانت بگۆڕە، هەرچەن كورتتر بێت باشترە.

### تەكنیكی ژمارە٦٦

ئەگەر دەتەوێ متمانەت هەبێت، پەیامی كورتو دۆستانە تۆمار بكە. مۆسیقا بەكارمەهێنە. نوكتە مەكە، پەیامی ئیلهامبەخش بەجێ مەهێڵە. زیادەڕۆیی مەكەو ستایشی خۆت مەكە. دواجار ڕۆژانە پەیامەكانت بگۆڕە. پێویست ناكات پەیامەكانت لەهەموو رویەكەوە تەواو بێت.

## چی بکەین وەڵامان بدەنەوە

ئەو کاریگەرییەی لەماوەی دەچرکەی یەکەمدا بەتەلەفۆن بەجێی دەهێڵیت ڕۆڵێکی بەرچاویی دەگێڕێت.

کەسانی پیشەیی نامەیەکی لاوازو کرچ و کاڵ بۆ کەسانی گەورە نانوسن چاوەڕوان ناکەن کەسێك بەمشێوەیە وەڵامیان بداتەوە. دەزانن ئەوەی نامەکە وەردەگرێت دەیکاتە سەبەتەی خۆڵ و خاشاکەوە.

فرۆشیاران، ڕکابەرەکان، کەسێك پەیامێکی تەواو دەنێرێت ، وەڵام وەردەگرێت. بەڵام ئەوانەی ڕەچاوی یاسای کار ناکەن ئەوەی دەیانەوێ پێی ناگەن، دیقەت بدە پەیامەکانت متمانەو باوەڕ بنێرێت. دەبێت خاوەنی ڕەوشێکی ئاشکرا بیت متمانەت پێ ببەخشێت، کاتێ دەڵێیت: "من جۆم، تکایە پەیوەندیم پێوە بکە." بێگومان وەڵامێکی نییە.

### سەرنجی کەسانیتر کێش بکە

پێشکەشکاری بەرنامەکانی ڕادیۆ هەوڵی ئەوە دەدەن گوێگرەکانیان بەوپەڕی دڵگەرمییەوە بیسەریان بن، فرۆشیارانی پیشەیی هەوڵی ئەوە دەدەن موشتەرییەکانیان پەیوەندیان پێوە بکەن، پێشکەشکارانی ڕادیۆ بۆ ئەوەی گوێگرەکانیان لەکاتی ڕێکلامی بازرگانی نەچنە سەر کەناڵ و وێستگەکانی دیکە پێیان دەڵێن دەسبەجێ دوای دەسپێکی بەرنامەی نوێ تیرو پشك دەکەن

خەڵاتی یەکێ لەگوێگرەکان دەکەن، جۆرێك قسە بکە ئەو وەڵامت بداتەوە، بۆ نمونە تەلەفۆن بۆ کەسێك دەکەیت ناچار دەبیت پەیامێکی بۆ بەجێ بێڵیت، دەتوانیت بڵێیت: "سڵاو، هێریی وەڵامی ئەو پرسیارەی هەفتەی پێشوو لێت کردم دۆزیمەوە." یان "سڵاو دایان، من بتسیم دەربارەی ئەو پرۆژەیەی پێکەوە قسەمان لەسەر کرد گەشتمە وەڵامێکی نایاب." بەمجۆرە قسەکردنو پەیام بەجێ هێشتن دایانو هێریی هەژێنێکی گونجاو پەیدا دەکەن تاکو وەڵامی تەلەفۆنەکەت بدەنەوە.

### تەکنیکی ژمارە ٦٧

**دە چرکە دەنگ هەڵبڕین**

**کاتێ ژمارەی مەبەست لێدەدەیت، گەروت ساف بکە. بزانە ئەگەر پەیامگری تەلەفۆن وەڵامت بداتەوە. لەهەمان ئەو دەچرکەیەی دەرفەت هەیە دەبێت جۆرێك قسە بکەیت وەڵامتان بدرێتەوە. بیستنی دە چرکەی دەنگێکی تۆمارکراو دەتوانێ جیاوازی نێوان وەڵامدانەوەو وەڵام نەدانەوە بێت.**

## ٦٨

### چۆن قسە بکەیت یاریدەدەر وابزانێ تۆ هاوڕێی خۆشەویستی کەسێکی گرنگیت

لەجیاتی ئەوەی کاتێ دەتەوێ کەسێك ببینیت یان قسە لەگەڵ کەسێك بکەیت ناوی کورتکراوەی بەیاریدەدەرەکەی بڵێ، ووشەی گەرمتر بەکار بێنە، بۆ نمونە لەجیاتی ئەوەی بڵێیت ئایا بەڕێز ئیسمیت لەوێیە، خۆت بەکەسێکی خۆمانە نیشان بدەو بڵێ: "لەوێیە؟ لەوێیە؟" ڕونتر، لەجیاتی ئەوەی ناوی تەواوی ئەو کەسە بێنیت ڕاناوی ئەو بەکاربێنە.

**تەکنیکی ژمارە ٦٨**

**بەکاربردنی ڕاناوی "ئەو"**

**لەجیاتی ئەوەی ناوی کەسەکە بەکار بێنیت. بەشێوەی ڕاناو پرسیار بکە. بۆ نمونە لەجیاتی ئەوەی بڵێیت: "ئایا بەڕێز براون لەوێیە." بڵێ: " سڵاو من جۆرجم. لەوێن؟"**

٦٩

## چی بکەین بڵێن خاوەنی هەستیارییەکی فراوانین

هەرکاتێ تەلەفۆنیی قسە لەگەڵ کەسێك دەکەیت شتێك زیاتر لەدەنگی ئەو دەبیستیت، ڕەنگە دەنگی سەگ، پشیلە یان هەر دەنگێکیتر ببیستیت. دەتوانی ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ دەکەیت لێی بپرسیت ئایا خاوەنی دەنگەکەی دواوە پێویستی بەئاگای تایبەتە؟ بەمجۆرە دڵی ئەوکەسەی قسەی لەگەڵ دەکەیت بەدەستی دێنیت. کاتێ لەئیدارەی خۆیدا قسە لەگەڵ کەسێك دەکەیت ڕەنگە زەنگی تەلەفۆنێکی دیکەت گوێ لێ بێت دەسبەجێ بڵێ: " تەلەفۆنەکەی دیکەت زەنگ لێدەدات ئایا پێویستە وەڵامی بدەیتەوە؟" تەنانەت ئەگەر پێویست بەم کارە نەکات. کەسی بەرامبەر لەم ڕەفتارەی تۆ دڵخۆش دەبێت.

**تەنیکی ژمارە ٦٩**

**"گوێم لەزەنگی تەلەفۆنەکەی دیکەتانە"**

کاتێ دەنگی زەنگی تەلەفۆنێکی دیکە لەدواوە دەبیستیت قسەکانت ببڕەو بڵێ: "دەنگی تەلفۆنەکەی دیکەتانم گوێ لێیە." پاشان لێی بپرسە ئایا پێویستە وەڵامی بداتەوە؟ ئەو بیەوێ ئەم کارە بکات یان نا، دەگاتە ئەم ئاکامەی تۆ کەسێکی بەستەری پەیوەندییەکی باشیت.

دەزانیت ئەو ڕۆژە جەژن یان ڕۆژێکی پشووی ئەو وڵاتەیە بۆ ئەو ڕۆژە تایبەتە پیرۆزبایی لێ بکە.

## چۆن لەمیانەی قسەی تەلەفۆنەوە
## گوێگرێکی باش بم

کاتێ بۆ دووەمجار گوێت لەدەنگێك دەبێت باشتر دەرکی دەکەیت. دەبێت بتوانیت بەقسەی پیشەیی و بازرگانی خۆت لەکاتی پێویستدا گوێ بگریت. زۆرجار ئاگامان لەوە نییە لەمیانە گفتوگۆکەدا چی ووترا مەگەر دوبارە گوێمان لێ بێتەوە. چۆن دەتوانیت بەقسەی تەلەفۆنی دەربارەی چالاکی کارتان دوبارە گوێ بگریتەوە؟ گەلێك ئاسانە. دەبێت قسەکانی خۆت و کەسی بەرامبەر تۆمار بکەیت.

لارا، بەجێگیر کردنی ئامێرێکی تۆمارکردنی دەنگ بۆ تەلەفۆنەکەی توانی گۆڕانکارییەك لەکارەکەیدا بکات، لارا، پسپۆڕێکی بواری لەقوتونانە توانی خواردنەوەیەکی زۆر تەندروست لەئاستی ناوخۆییدا بگەیێنێت بەفرۆشتن.

ڕۆژێکیان لەنوسینگەی کاری لارا بووم پێکەوە دەربارەی بەرنامەکانی قسەمان دەکرد، بەلارام وت کەسێك دەناسم خاوەنی چەندین فرۆشگای زنجیرەیی مادەی خۆراکییە، بەهۆی یەك لێدوانەوە کەبۆ کەسێکم کردبوو. قەرزێکم خستە ئەستۆی. کەسەکە توانی بەوتنی یەك ئەرێ خواردنەوە بەرهەم هێنراوەکەی هاوڕێکەم لەفرۆشگاکانیدا بفرۆشێت.

قسەم لەگەڵ ئەو کەسەدا کرد دەرکەوت ئەو حەز بەفرۆشتنی ئەم خواردنەوەیەدەکات، کەسەکە ویستی قسە لەگەڵ لارادا بکات. من تەلەفۆنەکەم

دایە دەستی لارا. گفتوگۆیەکی خۆشیان کرد، لارا وتی: " بەڵێ، هەڵبەت، نمونەکانتان بۆ دەنێرم.
ناونیشانتان لەکوێیە؟" پاشان بیستم لارا وتی: " ببورە، تۆزێك بۆستە تاکو قەڵەمێك دێنم." (من قەڵەمەکەی خۆم بەخۆشحاڵیەوە بەودا.) "دەکرێ دوبارەی بکەیتەوە؟ وتت پلاکی ٤٢٠١ یان ٤١٠٢ دەکرێ ناوی شەقامەکەم پێ بڵێت؟ ئاه، نەفرەتی قەڵەمەکە جوان نانوسێت. لیل لەسەر مێزەکەم قەڵەمێکی لێ نییە؟ ببورە دەکرێ دوبارەی بکەیتەوە؟"
زۆری نەمابوو تەلەفۆنەکەی بەزۆر لێوەرگرم. ئەگەر ئەو ئامێرێکی تۆمارکردنی هەبوایە هێندە کێشەی نەدەبوو. ئەو ڕۆژە ئەو کەسە ڕوبەڕو بونەوەیەکی باشی کردبوو، بەڵام چیتر تەلەفۆنی بۆ هاوڕێکەم نەکرد، تا ئەمڕۆ لارا لەبیری ئەوەدایە بۆچی ئەو کەسە وەڵامی ناداتەوە.
ئایا ئەو کەسە بەو بیانوەی لارا قسەی بەوجۆرە کرد کاری کردبوو، بێ ویژدانی نیشاندابوو، نا، کەسەکە گەشتبویە ئەو ئاکامەی ئەگەر ئەم موشتەرییە نوێیە بێ ئەوەی گوێبداتە کاتەکەی من هێندە کاتم بگرێت وای لەو کاتەی ببێە موشتەرییەکی سەرەکیم.

---

### ☆ تەکنیکی ژمارە ٧٠

**وەڵامی بەپەلە**

**هەموو گفتوگۆ بازرگانیەکانت تۆمار بکە پاشان دوبارە گوێیان لێ بگرەوە. بەمجۆرە دەتوانیت ئەو قسانەی جاری یەکەم ئاگات لێ نەبووە دوبارە گوێت لێ ببێتەوە.**

## بەشی هەشتەم

# لەمیوانیەکاندا وەك سیاسەتمەدارێك ڕەفتار بکە

زۆریەمان کاتێ دەچینە میوانیەکەوە. چەن خەیاڵێك دێت بەمێشکماندا .
بۆنمونە "میوانیەکی خۆشە... ڕەنگە کەسانی نایاب لەوێ ببینم. هیوادارم هاوڕێکەم لەوێ ببینم. چی لەبەر بکەم؟"
بەلام سیاسەتمەدارێك دەربارەی میوانیەك بەمجۆرە بیر ناکاتەوە، ئەوان پێرستێکی شەش بابەتیان پێیە لەوێ چ کەسێك؟ کێ؟ چی؟ چۆن؟ لەکوێ؟ چۆن؟ دەخەنە ژێر پرسیارەوە، باهەریەکێکیان ڕون بکەینەوە.

کێ لەو میواندارییە دەبێت؟
کێ لەوێیە تاکو چاووم پێی بکەوێت؟ دەبێت کێ بۆ کاری بازرگانی ببینم؟ دەبێت کێ بەهۆکاری سیاسی یان کۆمەلایەتی ببینم؟
ئەگەر نەزانن کێ لەو میوانیەدا ئامادەیە دەکرێت پرسیار بکەن. سیاسیەکان تەلەفۆن بۆ ڕێکخەری میوانیەکە دەکەنو دەپرسن: "کێن ئەو کەسانەی لەو میوانییەدا ئامادە دەبن؟" ئەوان ڕەنگە ناوی ئەو کەسانەی بەلایانەوە گرنگە یادلشتی بکەن پاشان بۆ چاو پێکەوتنیان هەنگاوی پێویست بنێن.
دەبێت کەی بڕۆم؟

سیاسیەکان خێرا بەسەرنجدان لەوەی ئەو جلەی لەبەری دەکەن تەواو دەبێت نایەنە میوانیەکەوە. ئەوان لەخۆیان ناپرسن "ئایا دەبێت درەنگ بڕۆم؟" ئەوان کاتی ڕۆشتن‌و کاتی هاتنە دەرەوەیان بەرنامەڕێژیی دەکەن. کەسانی ناودارو گرنگ زوتر دەچن تاکو کارو گفتوگۆکانیان ئەنجام بدەن، ئەم کەسانە هەرگیز شەرم لەزوو هاتنیان ناکەن هاوکات کەسانی ناودارو ناسراو دوایین کەسانێك نین زوو ئەو شوێنە بەجێ بێڵن.

٧١

## چۆن لەمیوانیەکاندا هەڵە نەکەین

کەسێکی ئاسایی، کەسێکی وەک چارلی، دەچێتە میوانیەک دەچێتە سەر ئەو مێزەی سوکە خواردنێکی لەسەرە کەمێ خواردن‌و ساردییەک هەڵدەگرێت پاشان چەن کەسێکی ناسراو دەدۆزێتەوەو دەکەوێتە قسەکردن لەگەڵیان.
ئەو لەکاتی خواردن‌و قسەکردن لەگەڵ هاورێکانی بیری دەچێتەوە چاوێك بەشوێنەکەدا بگێرێت تاکو بزانێت چ کەسانێك لەوێن، ئەو چاوەڕوانە کەسانی گرنگ بێنەی لای ئەوو خۆیانی پێ بناسێنن.
هەڵەکانی چارلی لەچیدایە؟ هەموو شوێنێکی کارەکەی هەڵەیە، لەوەیکە هێشتا نەهاتۆتە ژورەوە دەچێتە لای بوفەکەو خواردن‌و ساردی هەڵدەگرێت.
ئەوانەی لەوێن داوەری دەکەن‌و دەگەنە ئەوەی لەگەڵ کێدا هاوخوانن. ئایا تائێستا لەکێڵگەیەکدا ژیاویت؟ ئایا تائێستا سەگ یان پشیلەت هەبووە؟ دەزانیت هەرگیز نابێت ئاژەڵێك لەخواردن بکەیت. بەهەمانشێوە کاتێ مرۆڤێك خواردن دەخوات هەمیشە کەسێك ناچێەلای. ئەگەر ئامادەبوان لەو میوانیەدا بتبینن دەتەوێ خواردن بخۆیت، هەرگیز نایەن بەلای تۆدا ناخودئاگا بەخۆیان دەڵێن: "لێگەرێ ورگی پڕ بکات، دوایی قسەی لەگەڵ دەکەین."
سیاسیەکان هەمیشە بەرلەوەی بێن بۆ میوانی خواردن دەخۆن، ئەوان دەزانن نانخواردن‌و ئاخاوتن پێکەوە جۆر نابن.

تەکنیکی ژمارە ٧١

**ڕەفتاری دروست لەمیوانیدا**

سیاسەتمەداران هەرگیز بەدەستێك قاپی خواردن و بەدەستێکی دیکە پەرداخی خواردنەوە هەڵناگرن و بەم حاڵەشەوە لەگەڵ ئامادەبواندا بدوێن.

تۆش وەکو سیاسەتمەدارێکی باش بەرلەوەی بچیتە میوانیەوەکەوە حەز لەخواردن بکەیت.

## چۆن بەشێوەیەکی نایاب بچینە ژوورەوە

هـەموو کەسـانی بەرجەسـتە، دەرهێنـەران، پێشکەشـکاری بەرنامـە تەلەفزیۆنیەکان ڕەمەکی نایەنە سەر شانۆ، ئەوان هەمیشە تـاکو لای دەرگـای چونە ژوورەوەی هـۆڵ یـان شـانۆکە دێـن. لـەوێ کـەمێك دەمێننـەوە. سـەیرێکی دەورویەری خۆیان دەکەن جوان دیقەت دەدەن پاشان دێنە سەر شانۆ.

زۆرێـك لەپسـپۆڕان لـەو بـاوەڕەدان هەنـدێ لەئەسـتێرەکانی سـینەماو شـانۆ بەشێوەیەکی دێرماك ئوستادی هاتنە ژوورەوەن.

سیاسیەکان دەزانن چۆن دێنە سەر سەکۆی نمایش.

بەکۆمەکی یەك ڕەوشی سادە تۆش دەتوانیت هاتنە ژوورەوەی نایابت هەبێت.

بـەر لـەوەی بچـیتە ژوورەوە لای دەرگـای چـوونەوە ژوورەوە بۆسـتە سـەیرێکی ژوورەوە بکە بەچاوی خۆت بەئارامی سـەکۆی نمایشـەکە بپشـکنە. گرنگـە کاتـێ وەستاویت بیرێك بکەیتەوە کە"سەیری من بکە." هۆکاری وەستان لەبەر دەرگا خۆ دەرخستن و لوتبەرزیی نییە.

بەم کارە دەتەوێ هەل و مەرجی تایبەت هەڵسەنگێنیت. بەلامپەکان. مێزەکـان، لەهەمووی گرنگتر ڕوخسارەکان دیقەت بدە.

گوێ لەمۆسیقا بگرە سەرنجی دەنگی ئامادە بووان بدە، بزانە کێ لەگـەڵ کێـدا دەدەوێت، پاشان وەکو شێری گەورەی جەنگەڵ وەرە بۆ سەر سـەکۆی نمـایش یان ژەرەوە.

☆ تەکنیکی ژمارە ٧٢

**کاریگەریی لەکاتی چوونە ژوورەوە بۆ سەکۆی نمایش**

کاتێ دەچیتە نێو کۆڕو کۆمەڵێکەوە، لای دەرگای چوونە ژوورەوە کەمێ ئارام بگرە، پاشان بەئارامی چاوێك بگێڕە. لێگەڕێ چاوەکانت هەموو جێیەك ببینێت تاکو لێکدانەوەی دڵنیاییت لەکۆڕەکەوە دەست بکەوێ.

## چۆن چاووت بەو کەسانە بکەوێ کەحەز بەدیتنیان دەکەیت

سیاسیەکان چاوەڕێ ناکەن تاکو کەسانیتر بێن بۆ لایان، ئەوان لەکاتی چاوگێڕانیان بەو شوێنەدا لەخۆیان دەپرسن بڕیارە لەگەڵ کێدا بدوێم؟ کام یەك لەمانە دەتوانن بۆژیانی من سودمەندترین بن؟ زیاتر لەکێوە دەتوانم فێر ببم؟ چۆن هەڵدەبژێرن؟ ئەوان وەکو "باب" هونەرمەندی کاریکاتۆر لەکەسەکان دەڕوانن، ئەگەر لەکەسەکان دیقەت بدەیت دەتوانیت تێڕوانینی زیاتر بەدەست بێنیت. کەسێك دەڵێت: "لەتەمەنی سیی سالیدا

هەموو ڕوخسارێکیان هەیە کەشایستەیانە." بەدەگمەن لەنێوانی ئێمەدا هەڵدەکەوێ لەچاوانی کەسانی نامۆ وردبێتەوە. زۆرێکمان لەبەستنی پەیوەندی چاو بەچاودا لەگەڵ ئەو کەسانەی نایانناسین کێشەمان بۆ دروست دەبێت. من لەسیمینارەکانمدا کەسەکان هان دەدەم لەچاوی کەسانیتر دیقەت بدەن. پێیان دەڵێم دیقەتی چاوی یەکتری بدەن جوڵەی یەکتریی لێك بدەنەوە دەڵێم ڕەنگە خۆشەویسترین کەسیان لەم ژورەدا نەبێت .

بەڵام ڕەنگە ڕۆژێك تووشی کەسێك ببیت بتوانێ ژیانی تۆ بگۆڕێت دەمەوێ بۆ ئەم کارە ئامادەبیت هەبێت دەبێت ئازایەتی کارت هەبێت لەخۆوە چاوەڕێ نەبیت کەسێك خۆییت پێ بکەێنێت. من داوا لەبەشداربوان دەکەم هەرکەسێك چوار کەس هەڵبژێرێت و لەگەڵیاندا بدوێت.

**"تەنها جوانان هەڵدەبژێردرێن"**

کاتێ ئەم پێشنیارە دەکەم زۆربەیان وادەزانن تەنها نایابترین و جوانترین کەسانێك کەسێك بۆ ئاخاوتن پەیدا دەبێت. بەوجۆرە نییە، لەدیقەتدانی کەسانیتر هەرکەسێك لەڕوخساری کەسانیتر یەك دوو جوانی دەدۆزرێتەوە لایەنێکی تایبەتی هەیە.

یەکێ لەهاوڕێ نزیکەکانم کەسێکە بەناوی چیپ ئەو باڵای ١٥٥سم، لوتێکی زلی هەیەو چاویلکەی زەرەبینی لەچاوێکی زەقی دەرپۆقیو کردووە. بەبێ ڕەچاوکردنی ئەم تەکنیکە هەرگیز ناتوانم هاوڕێیەتی بکەم. بەڵام ئەو کاتەی ئەو وتاربێژیی دەکرد لەڕوخساری ورد بوومەوە گەشتمە ئەو ئاکامەی کەسێکی نایابە.

---

☆ **تەکنیکی ژمارە ٧٢**

**هەڵبژاردن بکە، نەك بژاردە بیت**

**هاوڕێی هەموو تەمەنی تۆ، عەشقی ژیانت هاوبەشی کارو پیشەیەك کەئاییندەی تۆ بگۆڕێت ڕەنگە لەو میوانییەدا ئامادە نەبێت. بەڵام ڕۆژێك لەشوێنێك ئەو کەسە دەبینیت.**

**لەهەر میوانییەك ئامادە بویت وەك مەشقێك بۆ گەیشتن بەو ڕۆژە مەزنە کەچاوەڕوانی دەکەیت سوود ببینە.**

---

## چۆن دەتوانیت سەرنجی کەسانیتر بۆ خۆت کێش بکەیت

ئایا تا ئێستا هەستت بەوە کردووە هێدی هێدی ڕۆشتن لەهەندێك لەژورەکان چ چێژێك دەبینیت؟ نیشتوکەکانیان جۆرێك داناوە وەك بڵێی بەخێرهاتنت لێبکەن داوات لێبکەن "وەرە لەسەر من دانیشە." لەهەندێ لەژورەکاندا دەبێت لەنێوان شتەکانیدا جیاوازییەك بدۆزیتەوە تاکو سەرەنجام شوێنێك بۆ دانیشتن بدۆزیتەوە.

بەهەمانشێوە دەستو پێو ئەندامەکانی هەندێ کەس بەجۆرێکن کەدەڵێن: "وەرە قسە لەگەڵ من بکە." هاوکات هەندێ کەسیش هەن بەجۆرێکن وەك بڵێن لێمان بەدوربە. زۆربەی شەرمنەکان دەڵێن لێمان بەدوربە.

بەسەرنجدان لەتوێژینەوەکان کەسانێك لەمیوانیەکاندا ئامادە دەبن. حەزو ئارەزوی زیاتریان لەقسەکردن هەیە، جەستەیان شێوەیەکی پەسەنی هەیە لەرخساریان خەندە دەبارێت. دوای حاڵەتی روخسار قۆڵو مەچەكو لەپی دەستەکان گرانبەهاترین ئەندامی جەستەن. کاتێ مەچەكو لەپی دەست بەرەو ژور بن. لەراستیدا دەڵێت شتێکم نییە بیشارمەوە. ئەوان لەئاستی قبوڵ کردنی هەمو شتێکدان. کاتێ گوێ بۆ قسەکانی هاوکارێکی بازرگانیت دەگریت دەتەوێ بۆچونەکەی پەسەند بکەیت. هەوڵبدە لەپی دەستت بەرەو ژور بێت.

ڕێگەیەك هەموار بکە بۆ ئەو کەسەی تۆ بەکەسێکی تایبەتدەزانێت.

ئاژەڵە ترسنۆکەکانی جەنگەڵ هەمیشە خۆیان دەشارنەوە تاکو لەئازاری ئاژەڵی درەندە بەدوربن. لەژیانی مرۆڤیشدا هەمانشێوەیە.
شەرمنەکان هەمان کار دەکەن. ئەوان هەوڵ دەدەن لەگۆشەیەك دانیشن یان نیشتۆکەکەیان لەشوێنێك بێت هیچ کەس نەیان بینێتو قسەیان لەگەڵ نەکات.

### تەکنیکی ژمارە ٧٤

**ئاگات لەزمانی جەستەی خۆت بێت**

موگناتیسی ڕەفتار بکە نەك پاڵنەر. کاتێ لەنێو کۆمەڵێکدا وەستاویت. جەستەت دەبێت حاڵەتێکی وەرگری هەبێت بەتایبەت قۆڵو بەپی دەست دەبێت لەحاڵێتێکی خوازراودا بێت. لەپی دەستو مەچەکت بەرو ژور بکەرەوە تاکو وتبێتت شتێکت بۆ شاردنەوە نییە.

## چی بکەین ئەوان هەستی ئەوەبکەن وەك ئەستێرەی سینەمایین

لەدەیەی ساڵی ١٩٤٠ فیلمە سینەماییەکان وەك ئەمڕۆ نەبوون. زۆرێك لەخەڵکی، بەسواری ئۆتۆمبێلەکانیان لەگەڵ منداڵەکانیان دەچوون بۆ سەیری فیلمەکان.

فیلمەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە بەڵام سروشتی مرۆڤ وەکو خۆی ماوەتەوە هەمووان خۆیان بەهاوشێوەی ئەستێرەی فیلمەکانی ١٩٦٠ دەزانن منیش و هەموو دنیاش.

بەلای ئەم کەسانەوە لەوەیکە چی بخۆم، چی بپۆشم، گرنگترە لەوەی لەفلان شوێنی دنیا چ کارەساتێکی مەزن ڕوو دەدات یان ژینگە گەرم بووە.

کەسانی سەرکەوتوو دەربارەی کەسێك کەبەلایانەوە گرنگە وردەکاری بابەتەکان شۆرڤە دەکەن و لەکاتی گونجاویشدا ئەم وردەکاریانە بەبیری خۆیان دێننەوە.

دەربارەی کەسانی مەبەستی خۆیان یاداشت دەکەن بیری خۆیانی دێننەوە ئەم کەسەیان لەکوێ بینیوە ئەوان چییان وتووە، پاشان دواین قسەکردنیان پێکەوە چی بووە چ جۆرە چالاکیەکیان هەبووە. یەکێ لەو کارە گرنگانەی ئەنجامی بدەیت ئەمەیە ساڵرۆژی سەرکەوتنە گەورەکان یاداشت بکەیت، ئارەزوە تایبەتەکان شتێکی دیکەیە دەتوانیت ئاماژەی پێبکەیت، خودی خۆم

پێشتر کەسێک هەڵەگیریی نوسینەکانی بۆ دەکردم لەگۆڤارێکدا، رۆژێک بێچوە پشیلەیەکی کڕیبوو ناوی نابوو کوکی، ماوەیەك لەمەوبەر ئەووم لە کۆڕێکدا بینی دوای هەواڵپرسین ووتم دیارە ئێستا کوکی بۆتە پشیلەیەکی گورە. بزەیەکی مانادارى کردو بەو بزەکردنەی پاداشتی دامەوە.

☆ **تەکنیکی ژمارە ۷۵**

**کاردانەوە**

**وەك کارپێسپێراوێکی کۆنترۆڵی تاوەرێك. لاوەکیترین بابەتی گفتوگۆی خۆت لەگەڵ کەسانیتر شرۆڤە بکە، ئەم هەنگاوە هاودڵییەکی بەرچاویی لەنێوان تۆ کەسی بەرامبەردا بەدی دێنێت. بەمجۆرە کەسی بەرامبەر خۆی بەکەسێکی گرنگ و پاڵەوان دەزانێت کەدنیا بەدەوری ئەودا دەسوڕێتەوە.**

## چۆن ئەوان سەرسام بکەین

چەن ساڵێك لەمەوبەر لەبەرنامەیەکی وەرگرتنی کۆمەك بەمەبەستی چالاکی سیاسی لەیەکێ لەویلایەتەکانی رۆژئاوا بەشداریم کرد. کەسێك سەرسامی کردم. ئەو یان لەگەڵ کۆمەڵێك سەرگەرمی قسەکردن بوو، یان بەتەنها لەکاتێکدا کاغەزێکی بەدەستەوە بوو لەگەڵ کەسێکیتر قسەی دەکرد. نزیکەی کاتژمێرێك بەردەوام بوو. بوبوم بەهاوسێیەکی بزێوی ئەو. ئەو کێ بوو؟
لەوساتە لەبەردەم مێزی خواردندا وەستا بووم. لەکاتێکدا بزەیەك لەسەر لێوی بوو بەرەو ڕووم هات و تەوقەی لەگەڵ کردم و خۆی ناساند: "من جو ئیسمیتم. چی دەخۆیت لەخزمەتتدام." پاشان دەستمان کرد بەقسەکردن. ویستم پرسیاری کارەکەی لێبکەم.
چەن خولەکێ دواتر یەکێك لەهاوڕێکانی خۆم لە ژوورەکەدا بینی ئیزنم لێخواست تاکو بچم بۆلای هاوڕێکەم. هەمان کات جو ئیسمیت داوای کارتی ڤیزیتی لێکردم، ئەو کارەم کرد هاوکات کەبەجێم هێشت بینیم لەسەر کارتەکەی من یاداشت دەکات، سەیرێکم کردو بەڕیتمێکی گاڵتەوە وتم: "یاداشتی چی دەکەیت؟"

بزەیەکی کردو وتی: " باش دەستت گرتم." پاشان پشتی کارتەکەی پێ نیشاندام ئەو خواردنەی من حەزم لێبوو نوسیبوی. گیرفانی پڕ بوون لەو کارتانەی لەپشتەکەی بابەتێکی خاوەن کارتەکەی نوسیبوو.
چەن هەفتیەك پێش ئێستا کارتێکی بۆ ناردبووم. تێیدا نوسیبوی دەیەوێ لەهەڵبژاردنی سینادا بەشداری بکات پاشان بەئامازەکردن بەو خواردنەی من حەزم لێ بوو پرسیبوی: "ئایا دواجار ئەو خوادنەی حەزت لێ بوو خواردت؟"

> ☆ **تەکنیکی ژمارە ٧٦**
>
> **دۆسییەی کارتی سەردان"ڤیزیت"**
>
> دروست دوای ئەوەی لەمیوانیەکدا قسەت لەگەڵ کەسێك کرد، قەڵەمەکەت لەگیرفانت دەربێنە. پاشان پەیوەست بەو ئاخاوتنەی لەگەڵ خاوەنی کارتەکەدا کردت بابەتێك لەپشتی کارتەکە بنوسە: ئەو چێشتخانەیەی ئەو حەزی لێیەتی، ئەو وەرزشەی ئەو پێی خۆشە، ئەو فیلمەی ئەو تامەزرۆیە بۆی و شتەکانی دیکە.

لەگفتوگۆی دواتر کەڕەنگە لەگەڵ ئەو کەسەدا دوبارە بێیتەوە. ئامازە بەحەزو خواستەکانی ئەو بکە.

☆ ٧٧

## فرۆشتن بەچاو

ئەو کرێیەی هاوڕێکەم جیمی لەفرۆشتن وەریدەگرێ ناباوەڕییە، تەنانەت سەرۆکەکەی پێی سەیرە. بەلام من هۆکارەکەی دەزانم، چونکە ئەو مەسەلەکەی پێ وتم. ئەو ناوی ناوە" فرۆشتن بەچاو".

جیمی دەڵێت لەم ڕەوشەدا پێویست نییە دەیان ڕەوشی فرۆش فێرببیت. لەجیاتی ئەوە هێندە بەسە چاوەکان بکەیتەوە سەرنجی کاردانەوەی کڕیارەکە بدەیت. جیمی، لەجیاتی گوێدان بەقسەکانی کڕیار زیاتر لەسەر زمانی جەستەی ئەو چڕ دەبێتەوە بەتایبەت جوڵە خۆنەویستەکان، لەجوڵاندنی جەستەو دەربڕینی دەنگ ڕادەمێنێت. جیمی، دەڵێت تەنانەت کاتێ کڕیارەکە قسەش ناکاتو بێدەنگە لەڕاستیدا پەیوەندی لەگەڵ تۆدا دەبەستێت.

جیمی فرۆشیاری کەرەسەی کارەبایی گرانبەهایە دەڵێت: "دەبێت لەڕەوشی فرۆشدا چاوێك لەسەر ئەم خاڵە چڕ بێتەوە کەبڕیاردەری ڕاستەقینە کێیە."

ئەو دەڵێت هەندێ لەجوڵەکانی جەستە مانای تەواو ئاشکرایان هەیە. بۆ نمونە شان هەڵتەکاندن نیشانەی گوێ پێنەدانە، ئەگەر کەسێ بەدەست بەمێزدا بکێشێت نیشانەی ناڕەحەت بوونی ئەوە. بەلام بەدەر لەمانە سەدان سەرەداوی تیکە بوونیان هەیە بەسەرنجدان لەزمانی جەستە دەبێت ئاماژەیان پێبکرێت.

ئەو دەڵێت: "من لەکۆشەیەکەوە لەحاڵەتی سەری کڕیارەکە ورد دەبمەوە ئەگەر ڕاستەخۆ سەری کڕیارەکە بەرەو من بێت. مانای ئەوەیە حەزی لەکڕینە لەم حاڵەدا منیش درێژە بەقسەکانم دەدەم. بەلام ئەگەر سەری بەرەو من

نەبێت یان سەری دانەوی بێت ئەوە نیشانەیەکی باش نییە. بەمەش تێدەگەم دەبێت باسەکە بگۆڕم لەسەر لایەنێکی دیکەی کاڵاکە بدوێم." جیمی نەك تەنها بەپێی کاردانەوەی کریارەکە قسە دەکات. بەڵکو لەکاتی پێویستو بۆ گۆڕینی کاردانەوەی جەستەیی کڕیارەکە کاری لەسەر دەکات، ئەو دەڵێت: "بۆ ئەوەی زەینی کڕیار ئاگای لای تۆ بێت دەبێت جەستەی تۆ ئامادەی وەرگرتن بێت. بۆ نمونە ئەگەر کڕیارەکە زۆر بەهێز دەستەکانی بەشێوە لێدان لەسەر سینەی خۆی دانان، دەبێت کارێك بکەیت دەستەکانی لەو حاڵەتە دەربێنێت. دەتوانی شتێك بدەیتە دەستی تاکو سەیری بکات. بەمشێوەیە دەستەکانی لەسینەی دور دەکەوونەوە. هاوکات جیمی، هەوڵ دەدات بەسەرنجدان لەچۆنێتی زمانی جەستە لەگەڵ بەرامبەردا بدوێت. کاتێ کڕیارەکە بۆ هەڵگرتنی شتێك دەست درێژ دەکات. ئەو گورو تینی دەنگی خۆی کەم دەکاتەوە. ئارامتر دەدوێت. کاتێ کڕیار دەرزییەك یان شتێکی مەبەستی خۆی هەڵدەگرێت لەڕاستیدا دەڵێت دەمەوێ بیر لەم بابەتە بکەمەوە. دیارە جیمی هەمیشە چاودێرە نیشانەی کڕیار دەربارەی حەزەکەی بۆ کڕین جیا بکاتەوە.

سەر تەکاندانی کڕیار بۆ سەروخوار نیشانەی حەز لەکڕین کردنە. گوێنەدان بەم جوڵەیە دەکرێت نیشانەی نەکڕین بێت.

**سوود لەچاو وەرگرتن تەنها بۆ فرۆشتن نییە.**

دۆستانو ئازیزانی ئێوەش حەزو ئارەزوەکانیان بەبێ درکاندنی وشەیەك نیشان دەدەن. کاتێ هاوڕێکەم دبورا لەگەڵ تۆنی هاوسەرگیریی کرد، بەلای هەموانەوە بێجگە لەخودی دبورا نەبێت دیاربوو ئەم کارەیان سەرکەوتو نابێت. چەن مانگ دوای هاوسەرگیرییان لەدبورام پرسی: "دبورا، ئایا دڵنیابیت تۆنی بۆ تۆ دروستکرابێت؟"

نۆی، لەکاتێکدا سەری بەرو خوارو ژورو راستو چەپدا تەکان دەدا وتی: "بەڵێ، سەد لەسەد. من ئەووم خۆشدەوێت حەزدەکەم هاوسەرگیریی لەگەڵ بکەم." ئەم هاوسەرگیرییە هەرگیز ئاکامێکی باشی نەبوو. جەستەی دبورا شتێکی پێناسە دەکرد کەزەینی ئاگای لێی نەبوو.

ڕەنگە کالایەکت بۆ فرۆشتن نەبێت بەڵام دەتەوێ دیدی خۆت بفرۆشیت، ئەگەر کەسێك گوێ بۆ قسەکانت گرتو لەکاتی قسەکردندا ڕوی خۆی لێ وەرگێڕایت بیر لەوە مەکەرەوە ئەو کەسێکی بێ ئەدەبە. لەخۆت بپرسە: "چۆن بتوانم شێوە قسەکردنم بگۆڕم تائەو تامەزرۆی قسەکانم بێت؟" دەتوانی بۆ کێشکردنی سەرنجی ئەو پرسیاری تایبەتی لێبکەیت: "جۆرج، وتت ناوی تیمی تۆپی پێی قوتابخانەکەتان چی بوو؟"

### ☆ تەکنیکی ژمارە ٧٧

**فرۆشی چاو**

**جەستەی مرۆڤ وێستگەیەکی پەخشی ٢٤ کاتژمێرەیە بەردەوام پەیان دەنێرێت. ""تۆ حەوسەڵەی من ناهێڵیت."، "من ئەم لایەنەی بەرهەمەکەی تۆم بەدڵە." بۆکۆمەکی ئەو دوربینەی دەیکەیتە چاوت نیشانە سپێردراوەکانی کڕیار یان هاوڕێ تۆمار بکە.**

تێبینی:

بەرلەوەی بچیتە کۆڕێك یان میوانییەکەوە خواردن بخۆ، دەستەکانت ئازاد بکە. کاتی چونە ژورەوە بۆ کۆڕ چەن ساتێك لەبەردەمی دەرگاکەدا بوەستە. تۆ

شتەکان هەڵبژێرە. نەك هەڵتبژێرن. ئەو کەسانەی دەتەوێ لەگەڵیاندا بدوێیت هەڵیان بژێرە.

ئامۆژگاری بەشەکانی پێشوو دەربارەی ڕووبەڕوو بوونەوەی خەڵکی فەرامۆش مەکە. لەڕەوشی وەڵامدانەوەی چاویان یان ئامـاژەی فرۆشی چاویی سوودمەندبە.

بەمەبەستی چاوپێکەوتنەوەی دواتر لەسەر هەرکارتێك لەکەسەکانی وەردەگریت بابەتێك دەربارەی خواستو حەزی ئەو بنوسە. هیچ کەسێك بەکەم مەزانە.

ئێستا دەگەینە پێشکەوتوترین بەشی کتێبەکە کەڕەنگە هەندێ لەبابەتەکانی بەلاتانەوە سەیر بێت بەڵام لەکاتی خوێندنەوەیەکی بەدیقەتەوە ڕەنگە بتوانی زیاتر بەسەر کێشەکاندا زاڵ بیت.

## بەشی نۆیەم

### کاتە دژوارەکان

### *جاری وا هەیە مرۆڤەکان شێوەی پڵنگ دەنوێنن*

کاتێ منداڵ بووم دایکم بردمی بۆ ئەنجومەنی میللی جوگرافیا تاکو فیلمەکان ببینم. یەکێ لەو فیلمانە دەربارەی پڵنگەکان بوو کەتاکو ئەمڕۆ دەمترسێنێن. من لەهۆڵی تاریکی سینەمادا دایکە پڵنگێکم بینی سێ بێچووی هەبوو قاچی یەکێکیان ناتەواو بوو. ئەم بێچوە ناتەواوە دروست لەبەردەمی دووبین بەدەستی بێچوەکانیتر کوژرا. بیرمە کاتێ دەگریام بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بێچوە ساغەکان هاوشێوەی هەندێ لەمناڵەکانی قوتابخانەی ئێمە بوون، ئەو منداڵانەی هەندێجار بێبەزەییانە ڕەفتاریان دەکرد.

لەقۆناغی سەرەتایی باشترین هاوڕێم ئیستیلا بوو. کچێکی زۆر باش بوو بەڵام کێشەی قسەکردنی هەبوو. زۆرێك لەمناڵانی پۆلەکە کاتێ ئەو قسەی دەکرد پێی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکرد. مناڵەکان هێندە نەگۆڕابوون. کاتێ لەکۆلێژەکان و گروپی نەوجەوانان قسە دەکەم . باسەکە زیاتر بەرەو نەرمی خۆشەویستی سەر دەکێشێت. هەموو دەیانەوێ خۆش بویسترێن. جاری واهەیە قوتابیان ئاماژە بەکەسێك دەکەن کەمئەندامەو کەسانیتر پێی پێدەکەنن. یان کوڕێك قاچی دەشەلێت بۆ یاری بەیس باڵ هەڵینابژێرن.

ساڵان تێپەڕین و منداڵەکان گەورە بوون. گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ شێوەیەکی دەرەکی بەخۆیەوە نابینێت. گەورەکان بەئەندازەی منداڵان ڕەفتاری ستەمکارانە نانوێنن. بەڵام دەربارەی ناتواناییەکانی کۆمەڵایەتی ڕەنگە ڕەفتاری ستەمکارانە بنوێنن، بەڵام زیاتر ئێمە ئاگامان لەناتوانایی کۆمەڵایەتی خۆمان نییە.

دیارە تۆش ئەوەت بیستووە زۆرێك لەکۆمپانیاکان لەڕوبەڕو بونەوەیان لەگەڵ ژنان یان کەمینەکان ڕەفتاری سنوورداروو جیاخوازی بەکار دێنن.

٧٨

## بەنادیدە گرتنی هەڵەکانیان
## خۆشەویستی ئەوان بۆ خۆت بکڕە

کاردانەوەیەکی شایانی سەرنجی دیکە چاومان بۆ جیاوازییەکی نێوان کەسانی سەرکەوتوو کەسانی شکست خواردوو دەکاتەوە. چەن ساڵێک بەر لەئێستا کارم لەسەر پرۆژەی یەکێك لەو کەسانە دەکرد کەسەردانی دەکردم. چوار کەس لەکارگێڕانو ئەو بانگ هێشتیان کردم بۆ ئێوارە خوانێك. ئەوان دەیانویست کێشەی کۆمپانیاکەی خۆیانم بۆ باس بکەن.

چووین بۆ یەکێ لەچێشتخانەکانی شار. زۆر قەرەباڵغ بوو زۆربەی کەسەکانی ئەوێ بازرگانو دەوڵەمەند بوون. بەڕێوەبەرانی بەرجەستە بەجلی فەرمییەوە دانیشتبوون نانیان دەخوارد. دەنگی قسەکردن لەهەموو لایەکەوە دەهات.

پێکەوە باسی گرفتو کێشەکانی کۆمپانیامان کرد. یەکێ لەهاوڕێکانم بەڕێز ویلسۆن سەرگەرمی قسەکردن بوو لەناکاو یەکێ لەگارسۆنەکان لەدووری کەمتر لەدوو مەترەوە سینیەك خواردنی لێ کەوتە خوارەوە. یەکێ لەپەتاتەکان تاکو ژێر مێزەکەی ئێمە هات لای قاچی بەڕێز ویلسۆندا وەستا.

هەموو دانیشتوان ئاوڕیان بۆ سەر مێزەکەی ئێمە دایەوە. هەریەکەو قسەیەکی دەکردو بەجۆرێك گاڵتەی دەکرد. بەڵام بەڕێز ویلسۆن درێژەی بەقسەکانیدا. کەسێك لەوانەی ئێمە تەنانەت سەیری گارسۆنەکەی نەکرد.

لەکۆڕو شوێن گشتیەکاندا ئەگەر کەسێك ناخواستە هەڵەیەکی کرد یان کارێکی خراپی لێوەشایەوە نەگوێی لێبگرە نەسەیری بکە.

ڕەنگە بڵێیت: "زۆر باشە، لەهەندێ لایەنی لاوەکیدا دەکرێت ڕوداوەکە نادیدە بگریت، بەڵام ئەگەر لەسەر مێزەکەی تۆ کەسێك پەرداخێك ئاوی قلْپ کردەوە ئاوەکە تاکو نوکی پێی تەڕ کردیت چی دەکەیت؟"

تا بۆت دەکرێت بەدەسرێك بەری بگرەو بیسڕە، لەم کاتەدا ئەو کەسەی ئاوەکەی ڕشتووە ڕەنگە داوای لێبوردن بکات دەکرێت پێی بڵێیت "هەرگیز گرنگ نییە" پاشان درێژە بەقسەکانی خۆت بدەرەوە.

☆ تەکنیکی ژمارە ٧٨

**گوێ بەقسەی بێبنەمای کەسانی تر مەدە:**

**ئەوکەسانەی شارەزان لە بەستنی پەیوەندییەکی نایابدا، گوێ بە قسەی بێ بنەمای کەسانی تر نادەن.**

## کاتێ قسە بەکەسانیتر دەبڕین
## چۆن دڵی ئەوان بەدەست بێنین

لەسەردەمی کۆنی ژاپۆندا ئەگەر ژیانی کەسێکت ڕزگار بکردبایە دەبوو ئەو پاشماوەی ژیانی خزمەتی تۆی بکردبایە. ڕوداوێك هەمیشە ڕوو دەدات، کەسێك باسی بابەتێك دەکات قسەکەی پێدەبڕن. کەسێکی تازە دێتە نێو باسەکەوە، کەسێك بەسینیەك چاو بسکیتەوە دێتە ژورەوە یان منالێك دەست دەکات بەگریان لەپڕ سەرنجی هەموو کەسە تازە هاتووەکان کێش دەکات. کەسێك گوێ بەوەستانی قسەکردنەکە نادات بێجگە لەوەی لەحاڵەتی قسە کردندایە، هەموو ئەو ڕاستیە لەبیر دەکەن کە بێژەر هێشتا قسەکەی تەواو نەکردووە.

یان لەژوری دانیشتن کەسێك نوکتەیەك دەگێڕێتەوە لەم کاتەدا جانی بچکۆلانە قسەیەك دەکات یان شتێك دەخاتە خوارەوە یان زەنگی تەلەفۆن لێدەدات، دوایی هەمووان بۆ کەوتنە خوارەوەی شتەکەی دەستی جانی بچکۆلانە قسەی لەسەر دەکەن. دوای پەیوەندییە تەلەفۆنیەکە هەموو باسی هاوسەرگیریی بەو ژنانەی یەکێ لەهاوڕێکان دەکەن. کەسێك بێجگە لەو کەسەی نوکتەکە دەگێڕێتەوە ئاگای لەبڕینی ئەو بابەتە نەماوە.

زۆربەی چیرۆك بێژان و نوکتەچیەکان ترسنۆکترن لەوەی دوای بڕینی قسەکەیان بڵێن: "ویستم بڵێم..." لەجیاتی ئەوە هەموو شەوێك بەهەستێکی ناڕەحەتەوە بەسەر دەبەن چونکە نەیانتوانیوە قسەکانیان تەواو بکەن.

بزانە بێژەر چەن خۆشحاڵە بەوەی دۆخێکی بۆ بسازێنیتەوە تاکو قسەکەی تەواو بکات.

### تەکنیکی ژمارە ٧٩

**زمانێکی کۆمەك بەقەرز بدە**

هەرکاتێ کەسێك بەسەرهاتێکی گێڕایەوە قسەکەیان پێ بڕی. یان شتێك ڕویداو کۆتایی هات.

ڕوبکەرە بێژەرەکە بڵێ: "زۆر باشە، بابگەڕێینەوە سەر باسەکەمان."

یان باشترە بڵێیت: "بگەڕێنەوە سەر قسەکەی خۆمان. باشە. چیتر ڕویدا."

## چۆن بەوان بڵێین چ سودێکی بۆیان هەیە

هەموو کەسەکان کاتێ هەواڵێك دەبیستن بەخۆیان دەڵێن ئەمە چ سودێکی بۆ من هەیە. بەراست، چ سودێکی بۆ تۆ هەیە؟
جارێك ئاشنایەکی خۆمم بۆ نانخواردن بانگ هێشت کرد. ویستم لەگەڵ سام کەسەرۆکی ئەنجومەنی بازارسازیی بوو قسە بکەم. بەسامم وت: "کات و باشترین چێشتخانە هەڵبژێرە."
ئەو ڕۆژەی دیاریمان کرد بۆ نانخواردن، ناچار بووم ٤٥ خولەك بەئۆتۆمبیل بۆ ئەو شوێنەی چێشتخانەکەی لێ بوو بڕۆم، کاتێ چوومە چێشتخانەکەوە بینیم کۆمەڵێك لەگەڵ سام قسە دەکەن ئەمەش کاتێکی گونجاو نەبوو بۆ ڕاوێژکردن بەو. تاکاتی تەواوبونی نانخواردنەکە درێژەی کێشا تازانیم سام چۆن ئەمانەی لەگەڵ خۆی هێناوە ئەو دەیوست هەرکامیان دەربارەی ڕۆڵی خۆیان لەو ڕێکخراوەی کاریان تێدا دەکرد بدوێن. مەخابن لەم دانیشتنەدا کەهەم کاتی من و کاتی سامیش بەهەدەر چوو هیچ کامێکمان بەخواستی خۆمان نەگەشتین.
لێگەڕێ باهاوکاریت بکەن:
کەسانی سەرکەوتوو کاتێ داوای هاوکاری لەکەسێك دەکەن گوێ بۆ قسەکانی دەگرن. زۆرێك لەخەڵکی بیریان دەچێت کەسێك لەپلەی ڕێنماییدا قسەیان بۆ دەکات بلێن قسەکانی تا چ ئەندازەیەك کۆمەکی پێکردوون. یەکێ لەهاوڕێکانم

بەناوی ستیڤن لێی پرسیم ئایا من گروپێکی میوزیک دەناسم لەمەراسیمی ئاهەنگی ساڵانەدا میوزیک لێبدەن. پێم وت: "نا، بەداخەوە من کەسێك ناناسم.
" بەڵام ستیڤن دەسبەردار نەبوو. لێی پرسیم: "لیل، مەگەر تۆ سەردەمێك لەگەڵ تیپێکی مۆسیقادا لەکەشتیەکەماندا بەرنامەت پێشکەش نەدەکرد؟"
وتم: "چۆن، بەڵام دەمێکە هەواڵم لێیان نییە." وامزانی بەمە تەواو بوو. بەڵام ستیڤن بۆچونێکی دیکەی هەبوو. بەدەوام لێی دەپرسیم. تائەوەی دواجار پێم وت: "ستیڤن، کێ بەرپرسی دۆزینەوەی تیپی مۆسیقایە؟" ئەو بەشەرمێکەوە وتی: "من."
"ستیڤن، بۆ نەتوت من بەرپرسم؟ باکەمێ توێژینەوە بکەم تاکو بزانم دەتوانم سەرەداوێك بدۆزمەوە." خۆشحاڵ بووم کارێك بۆ هاورێکەم بکەم. بەڵام ستیڤن بەنەووتنی ئەوەی چەن بەلایەوە گرنگە، پێگەی خۆی خستە مەترسییەوە.
کاتێ داوای چاکەیەك لەکەسێ دەکەیت پێی بڵێ ئەو چاکەیە یان ئەو شتە چەن بەلای تۆوە گرنگە. بوار بدە ئەو کارەی بۆت دەکەن چێژی لێ ببینن.

### ☆ تەکنیکی ژمارە ٨٠

### گرنگی چاکەیەك بدرکێنە

**هەرکاتێ پێشنیاری دانیشتێك دەکەیت، یان داوای چاکەیەك لەکەسێك دەکەیت، ئاماژە بەسوودەکەی بکە بۆ هەردوولا. بائەوان دەرك بەوە بکەن ئەم کارە بۆ تۆ تاکو چ ئەندازەیەك گرنگە.**

## ٨١

## چی بکەین بیانەوێ کاێکمان بۆ ئەنجام بدەن

یەکێ لەو کەسانەی سەردانیان دەکردم بەناوی سوزان خاوەنی بنکەیەکی مامەڵەی موڵکەکان بوو. جارێك لەشوێنکارەکەی خۆیەوە دەربارەی پرۆژەیەك قسەمان دەکرد، سکرتێرەکەی تەلەفۆنی کرد. "ببورە خانم ئیوانز، برای هاوسەرەکەت، هێڵی لەسەر هێڵە."

خانم ئیوانز، بزەیەکی کرد: "بەڵێ فەرموو پەیوەندییەکە گرێ بدە." پاش ئەوەی ئیزنی لەمن خواست، تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. چەن ساتێك لەژوورەکەی ئەرهاتە دەرەوە تاکو قسەی خۆی بکات."

کاتی گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی، ئەو وتی: "بەڵێ، بێگومان پێی بڵێ پەیوەندیم پێوە بکات." پاشان تەلەفۆنەکەی داخستەوە، ئەو وتی برای مێردەکەی بوو کچە پورێکی هەیە لەوێستگەیەکی سوتەمەنی کار دەکات ئێستا دەیەوێ لەبنکەی مامەڵەی موڵکەکان کار بکات، پاشان ئاماژەی کرد: "پیاوێك دەیەوێ تەلەفۆنم بۆ بکات تاکو ئەگەر بتوانم هاوکاری بکەم." بەئاشکرا دیار بوو دەیەوێ کارێك بۆ برای مێردەکەی بکات. ئێمە درێژەمان بەقسەکانی خۆماندا.

چوار خولەکی پێنەچوو بوو سکرتێرەکەی دوبارە تەلەفۆنی کردەوە: "خانم ئیوانز، کەسێك بەناوی سونی لیکر دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکات، دەڵێت کچە پوری برای مێردەکەی تۆیە." هاوڕێکەم لەبەر ئەوەی بەو پەلەیە کاری کردبوو.

سەرسام بوو. برای مێردەکەی پەیوەندی کردبوو بەکچە پورەکەیەوە هەرچی زوترە لەگەڵ هاوڕێکەم دانیشتنێك بکەن.

کچە پور بەپێچەوانەی کەسە سەرکەوتوەکانەوە دوچاری هەڵە بوبو. کەسانی سەرکەوتوو دەزانن کاتێ کەسێك چاکەیەکت لەگەڵ دەکات، دەسبەجێ لەجێی خۆت ڕامەپەڕە . ئەو کەسەی بڕیارە چاکەیەکت لەگەڵ بکات مۆڵەتێکی پێ بدە تاکو ئەو کارەی دەیەوێ بۆ تۆی بکات بەئاسانی بیکاتو هەستێکی باشی بۆ دروست ببێت.

☆ تەکنیکی ژمارە ٨١

مۆڵەت بدە ئەو چاکەیەی لەگەڵ تۆدا دکرێت. چاکەکار چێژی چاکەی خۆی بچێژێت. لانیکەم با ٢٤ کاتژمێری بەسەردا بڕوات.

٨٢

## چۆن داوای چاکە بکەین

ڕۆژێك داوام لەیەکێ هاوڕێکانم کرد کەپەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ کەسانی بالادا هەیە کەسێکم پێ بناسێنێت تاکو لەپرۆژەیەکدا هاوکاریم بکەن.
تانیا، ناوی ئەو کەسانەی پێدام کەدەیانتوانی هاوکاریم بکەن هەردوکمان دەمانزانی من کاتێکی زۆری ئەووم گرتووە.
کاتێ بۆ سوپاس کردن تەلەفۆنم بۆ کرد، وتی: "دڵنیام ڕێیەك دەدۆزیتەوە قەرەبوی کاری من دەکەیتەوە."
"بێگومان، دودڵ مەبە." ئەو لەڕاستیدا پێی وتم لەبەر هاوڕێیەتی کارێکی بۆ نەکردووم بەڵکو لەبارتەقایدا بەکارێك قەرەبوی بۆ بکەمەوە.
دوو ڕۆژ دواتر تانیا، تەلەفۆنی بۆکردم وتی لەم چەن مانگەی ئایندەدا سەفەرێك بۆ نیویۆرك دەکات. ویستی بزانێ ئایا من دەتوانم لەماڵەکەمدا جێگەی بۆ بکەمەوە. بێگومان دەمتوانی بەڵام ئەو پەلە کردنە وایکرد من گوێ بەداواکەی نەدەم. هەمیشە ئەگەر دەتەوێ قەرەبوی چاکەیەکی خۆت وەربگریتەوە ، دەبێت ماوەیەك ئارام بگریت. دیارە من خۆشحاڵ بووم کەبەو زوانە لەژێر قەرزی ئەو دەرچووم.
هەرکاتێ چاکەیەك لەگەڵ کەسێك دەکەیتو لەبەرامبەریدا چاکەی ئەو کەسەت دەوێتەوە، نزیکەی سێ هەفتەیەك بخایەنە. ئەمە کارێکە کەسانی سەرکەوتوو ئەنجامی دەدەن.

**تەکنیکی ژمارە ٨٢**

**چاکە بەچاکە**

کاتی چاکەیەك لەگەڵ کەسێکدا دەکەیت. ئەو لەبەرامبەر شتێکی تۆدا قەرزارە، ماوەیەك خۆت بگرە پاشان داوای قەرەبوی چاکەی خۆت بکەرەوە. مۆڵەت بدە ئەو چێژ لەو چاکەیە ببینێت بۆ تۆی ئەنجامداوە لەبەرامبەر داواکردنەوەی چاکەی خۆتدا کاری بەپەلە مەکە.

## ٨٣

## چۆن بزانین نابێت چ قسەیەك بکەین

لەکۆندا ئەو دزانەی پۆلیس دوایـن دەکـەوتن پـەنایان بـۆ کەنیسـە دەبـرد چونکە دەیانزانی پۆلیس بۆ گرتنیان نایەنە کەنیسەکانەوە.
کاتێ گەلە گورگ دوای کەروێشك دەکەوون کەروێشك هەوڵی ئەوە دەدات خـۆی لەکونی دارێکدا بشارێتەوە، چونکە دڵنیایە دەستی گورگی پێ ناگات.
لەجەنگەڵی مرۆییدا کەسەکانیش پەنایەکیان هەیە.
هاوڕێیەکم هەیە بەناوی کریستین، هەموو ساڵێك بۆ کریسـمس بـانگم دەکـات بـۆ کۆمپانیاکەی خۆی. ئێوارەی ئـەو رۆژە کاتـێ کریسـتین بەرنامـەی میوانیەکەی بەجێ هێشت پێێ وتم دەتوانێ من بگەێنێتە ماڵەوە، ئەو کاتەی ویستمان بڕۆین یـەکێ لەکارمەنـدەکانی کریسـتین لێـی نزیـك کەوتـەوە وتـی ئەگـەر نیـوەی خەرجیەکان بۆ بەڕێوەبردنی مەڵبەندی چاودێری منالی کارمەندەکان بکات ئـەوا حەوت دایك دەتـوانن منالـەکانیان بنێـرن. کریسـتین دەسـتی ئـەو ژنـەی گـرتو وتـی: "بـەلێ، دروسـتە. ئەگـەر پێـت باشـە باکاتـژمێرێك لـەم بارەیـەوە قسەبکەین."
کاتـێ لـەماڵی ئێمـە نزیـك بوینـەوە، کریسـتین وتـی: "نـازانی، ئەمشـەو چـەن خۆشحاڵ بووم."
وتم: "تۆ چێژێك لەبەرنامەکە بینی؟"

"بەڵێ، چێژم بینی. بەڵام کەس نازانێ چی ڕوو دەدات. بۆ نمونە سەرنج بدە لەوەی جین، ئامازەی پێکرد." پاشان ڕوونی کردەوە دەستەی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا تائێستا چەن کۆڕێکیان بۆ کردنەوەی دایەنگا سازکردووە، من لەکریستینم پرسی: "بۆچی باسەکەت بۆ جین ڕوون نەکردەوە؟"
وتی: "کاتێکی گونجاو نەبوو بۆ ئەم کارە." کریستین وەك کەسێکی سەرکەوتوو ڕەفتاری کرد. ئەو کاتو شوێنە گونجاو نەبوو بۆ مشتومڕ کردن.

☆ تەکنیکی ژمارە ٨٣

**میوانی بۆ خۆش ڕابواردنە**

لەجەنگەڵی مرۆییدا چەن شوێنێك هەیە تەنانەت دڕندەترین پڵنگ هێرشی بۆ نابات. یەکێك لەوانە میوانیەکانە.
میوانی بۆ خۆش ڕابواردنە نەك بۆ ململانێ و ڕو بەڕو بونەوە. کەسانی سەرکەوتوو مەزن تەنانەت کاتێ لەسەر مێزێك نزیکی دوژمنانی سەرسەختی خۆیان دەبنەوە لەگەڵیاندا مشتومڕ ساز ناکەن. ئەم کارە بۆ کاتێکی گونجاو دوادەخەن.

## ٨٤

## چۆن بزانن لەسەر مێزی نانخواردن چ قسەیەك بکەین

ئایا دەزانی بۆچی بەرنامەی نانخوارنی سەرۆکە مەزنەکان درێژە دەکێشێتو جاری واهەیە تاکو ئێوارە دەخایێنێت؟ ڕەنگە بەشێکی بەهۆی ئەوە بێت بیانەوێ لەسەر حسابی کۆمپانیا تاکو دەتوانن بخۆنو بخۆنەوە. بەڵام هۆی سەرەکی ئەمەیە مێزی نانخواردن لەمیوانی پیرۆزترە. کەسانێك لەسەر مێزی نانخواردن نانی بەیانی یان ئێوارە دادەنیشن دەزانن دەبێت دەربارەی مەسەلەی ناخۆش نەدوێن. مشتومڕ ئیشتها کوێر دەکات. ئەگەر لەکاتی نانخواردن شتێك ڕوو بدات، کەسانی سەرکەوتوو ئەو مێزە بەجێ دێڵن تاکو لەسەر مێزێکی دیکە ئەو کاتە بەڕێ بکەن.

> **تەکنیکی ژمارە ٨٤**
>
> **ئارامی مێزی نانخواردن**
>
> **کەسانی سەرکەوتوو لەسەر مێزی نانخواردن پێکەوە مشتومڕ ناکەن، ئەوێ شوێنێکی گونجاو نییە. دەکرێت باسی خواستو حەزەکانی تێدا بکرێت. دەتوانی بیرۆکەی نوێ پێشکەش بکەیت، بەڵام هەرگیز باسی بیرەوەری تاڵو جدی مەکە.**

## ٨٥

## لەچاوپێکەوتنی ڕێکەوتدا
## دەبێت چی نەوترێت

بزانە، کەسانی سەرکەوتوو کاتێ بەڕێکەوت لەمیوانیەک، کۆڕێک، شەقامێك یان کۆمەڵێکدا دەبن دەربارەی کاری بازرگانی خۆیان نادوێن. کەسانی سەرکەوتوو کەشێکی ئاسودەو ئارام بۆ یەکتریی دەسازێنن، پێکەوە دەدوێن بەڵام دەربارەی کاریان هیچ شتێك ناڵێن.

**تەکنیکی ژمارە ٨٥**

**لەچاوپێکەوتنی بەڕێکەوتدا لەگەڵ یەکتر قسەی خۆش بکەن.**

**ئەگەر لەکاری فرۆشتندا گیرۆدەی باسێکی هەستیاریت لەگەڵ کەسێکدا لەسەر چاوپێکەوتنێکی بەڕێکەوت باسەکە ئاوەڵا مەکە، با چاوپێکەوتنەکەت ڕیتمێکی خۆش بەخۆیەوە ببینێت. بێجگە لەمە گرفتەکان بەرۆکت دەگرنەوە.**

## ٨٦

### چۆن ئەوان ئامادە دەکەیت گوێ بۆ قسەکانت بگرن

شەوێک لەیەکێک لەشەقامەکانی نیویۆرکدا دزێکم بینی دەیویست ئۆتۆمبێلێک بدزێت، هاوارم بەسەریدا کرد بەڵکو دەست لەم کارە بکێشێتەوە، دزەکە دەستی لەکارەکەی کێشایەوە هاتو بەتەنیشتمدا تێپەڕیو پاڵێکی پێوەنام کەوتم سەرم شکا. هەرچۆنێک بوو خۆم گەیاندە بەشی فریاکەوتنی نەخۆشخانەیەک. چەن پەرستارێک لەدەورم کۆ بونەوە. یەکێ کارتی ناسنامەی دەویستو یەکێ ژمارەی دڵنیاییو سێیەمیش کارتی بیمەی دەویست ئەوەی لەهەمووی زیاتر بێبایەخ بوو شکاندنو برینەکەی سەری من بوو. دواجار کەسێک پرسی: "باشە، چی ڕویداوە؟" ئەگەر دەتەوێ قسەیەک بۆ کەسێک بکەیت سەرەتا زەینی ئەو بەتاڵ بکەرەوە. ئەگەر دەتەوێ تەنکیەک پڕ بکەیت لەبەنزین سەرەتا خاڵی بکەرەوە.

**تەکنیکی ژمارە ٨٦**

ئەگەر پێویستت بەزانیارییە. سەرەتا مۆڵەتی کەسانیتر بدە قسەی خۆیان بکەن، خۆت ڕابگرە تاکو زەینیان خاڵی دەبێتەوە، کاتێ دڵنیا بویت تەنکی ئەوان بەئەندازەی تەواو خاڵی بۆتەوە، ئەوا تۆش قسەی خۆت بکە بۆیان.

٨٧

## چۆن بەسێ ڕستە یان کەمتر
## توڕەیی ئەوان هێور بکەینەوە

چەن مانگێک لەمەوبەر هاوڕێم فیل، دەیویست پانتۆڵێک بکڕێت داوای لێکردم بیبەم بۆ سەیری جلەکانی ئیل بین. فیل جلەکانی زۆر پێ جوان بوو پانتۆڵێکی هەڵبژارد. ئەو لەکاتی چاوپێکەوتنی هاوڕێکەی ئەو پانتۆڵەی لەپێ کرد تاکو پێکەوە بچن بۆ ئێوارە خوانێک، هاوڕێکەی فیل کیفەکەی لێکەوتە خوارەوە فێل چەمییەوە تاکو بۆی هەڵگرێتەوە لەم کاتە درزی پانتۆڵەکەی دڕا.

ئەو کەسانەی لەوێ بوون سەیری شوێنێکی تریان کرد. بەڵام فیل زۆر شەرمەزار بوو. کاتێ بەسەرهاتەکەم بیست لەئێل بین زۆر دڵگران بووم دەسبەجێ تەلەفۆنم بۆ یەکێ لەبەرپرسانی خزمەت کرد، کاتێ بەسەرهاتەکەی فێلم بۆ گێڕایەوە. هاوخەمیی خۆی بۆ دەربڕیم، بەڵام من هێشتا ناڕەحەت بووم. ئەو تەواو گوێی بۆ قسەکانم گرتبوو تاکو ئەو گرفتەی ڕوویدابوو جوان دیقەتی لێبدات، کاتێ من گێڕانەوەکەم تەواو کرد ئەو وتی: بەڕاستی کارەساتێکی ناخۆش بووە. تەواو دەرکی پێدەکەم، بێگومان هاوڕێکەت زۆر شەرمەزار بووە.

لەوەڵامدا ووتم: بەڵێ، هەروا بووە.

"تۆش شەرمەزار بویت لەوەی پێشنیاری جلەکانی منت بۆ کردووە."

من کەمێك نارامتر بوبومەوە وتم: " بەڵام بەرهەمەکانی ئێوە بەڕاستی نایابن."

"بەداخم بۆ ئەو کارەساتەی بەسەرتان هاتووە."

"نا، خەتای ئێوە نەبوو." من بەتەواوی هێور بوبومەوە. "دیارە هەڵەیەك ڕویدا بوو."

☆ **تەنکیکی ژمارە ٨٨**

**لەگەڵ هەستی ئەواندا هاودەنگبە**

ڕاستیەکان خۆیان دەدوێن، هەستەکان هاوار دەکەن. هەرکاتێ دەربارەی دۆخێك هەستی کەسانیت و ڕاستیەکانت دەوێت. بوار بدە ئەوان هەستەکانی خۆیان دەربڕن، ڕاستیەکانی ئەوان ببیستەو لەگەڵ هەستەکانیان هاوخەمبە.

☆ ۸۸

## چی بکەین لای ئەوان خۆشەویست بین

ڕۆژی دواتر کۆمپانیای بەهەم هێنەر پانتۆڵێکی نوێی بۆ هاوڕێکەم ناردو بەنوسراوێك داوای لێبوردنی لێکرد. ئایا من جارێکیتر جل لەو کۆمپانیایە دەکڕم؟ بەڵێ، سەد لەسەد، ئایا پێشنیاری کڕین بۆ هاوڕێیو ئاشناکانم دەکەم؟ بەڵێ، بێگومان، بەرپرسانی خزمەتی کڕیاران بۆ یە ئەم هەنگاوی قەرەبو کردنەوەیە دەگرنەبەر چونکە دەزانن ئەم کارە هۆی ناوبانگو ئابڕومەندی خۆیانە.

☆ تەکنیکی ژمارە ۸۸

**هەڵەی منو قازانجی ئێوە**

هەرکاتێ هەڵەیەك دەکەیت. کارێك بکە کەسی زیانکردوو قازانجێك بکات، ڕاستکردنەوەی هەڵەی خۆت بەس نییە. لەخۆت بپرسە: " ئەو کەسەی لەدەستی من زیانێکی کردووە دەبێت چی بۆ بکەم تاکو لەوەی ڕویداوە ئەو خۆشحاڵ بێت." پاشان ئەم کارە بەخێرایی بکە. بەمجۆرە سوود لەهەڵەکردنەکەت دەبینیت.

## ٨٩

## ڕو بەڕو بونەوەی گونجاو
## لەگەڵ کەسانیتر

لەژاپۆن هەندێك لەهاوشارییەکان پێیان باشە بمرنو ئابرویان نەچێت. لەئەمریکا هەندێ لەهاوشارییەکان پێیان باشە کەسانێك ئابرویانیان بردون بمرن. بۆچی دژایەتی بکەین؟ تاکو کاتێ ئەرکێکت لەسەر شان نییە بەبەرامبەر ڕو بەڕو ببەرەوە، کارێکت پێیان نەبێت. بەڵام لەژیانی خۆت دوریان بخەرەوە. کەسانی سەرکەوتوو هێندە گوێ بەخەتاباران نادەن، بەڵام لەسنوری خۆیان دەیانکەنە دەرەوە. لەڕاستیدا ئەوان دەڵێن تۆ بەهای ئەوەت نییە من قسەی خۆم لەڕەفتاری تۆدا بەهەدەر بدەم. کەسانی سەرکەوتوو هەڵەی لاوەکی ئەو هاوڕێیانەی دەیانەوێ هاوڕێیەتی بپارێزن لای خۆیان دەنوسن. بۆ نمونە ئەگەر ئەو هاوڕێیەی بانگ هێشتی دەکەن درەنگ بگاتە جێ، پێی دەڵێن: "خەتای تۆ نەبوو. خەتای من بوو ڕێیەکی پێچو ئاڵۆزم بەتۆ نیشانداوە."

### تەکنیکی ژمارە ٨٩
**مۆڵەتی هەڵاتن بدە**

**هەرکاتێ هەستت کرد کەسێك درۆ دەکات، زیادە ڕۆیی دەکات، یان خەریکی فێڵو تەڵەکەبازییە، ڕاستەخۆ ڕوبەڕوی مەبەرەوە، بوار بدە کەسی تاوانبار لەداوی تۆ هەڵبێتو ڕابکات، پاشان کارێك بکە ئەو لەژیانی تۆدا دربچێتو دوربکەوێتەوە.**

☆ ٩٠

## چۆن ئەوەی دەتەوێ پێت بەدەستی بێنیت

سەردەمێك زۆر پێویستم بە فۆتۆكۆپی هەبوو. ئاستی كار هێندە بوو كارمەندی ئەو فرۆشگایەی فۆتۆكۆپی دەكرد پێی وتم لەوە ناچێت بتوانێ زوتر لەكۆتایی هەفتە كارەكەی من تەواو بكات بۆیە وتی كە" هەوڵێ خۆم دەدەم." بەخۆشحاڵییەوە وتم: "دەسخۆش، ناوی سەرۆكەكەت چییە؟ بێگومان دەبێت بۆ تۆ سوپاسنامەیەك بۆ ئەو بنوسم، بەڕاستی تۆ هەوڵێكی زۆر بۆ خزمەتی مشتەرییەكان دەدەیت." كارەكەی من دوو ڕۆژ زوتر لەكاتی دیاریكراو تەواو بوو، ئەو كارمەندە هەرجارێك دەچووم بۆ ئەوێ بەگەرمی پێشوازی لێدەكردم.
پەندێكم لەم ئەزمونە وەرگرت لەوە بەدواوە لەنوسینی نامەی ستایش ئامێزی كارمەندا درێغیم نەكردووە.

بەڕێز (ناوی سەرۆك یان بەرپرس) خۆشەویست،

دەزانم خزمەتی موشتەرییەكان بۆ بەڕێزت تاكو چ ئەندازەیەك گرنگە. دەمەوێ بەنوسینی ئەم نامەیە لە (ناوی كارمەند) هاوكاری بەڕێزت سوپاس بكەم. ئەو لەئاستێكی باڵادا خزمەتی موشتەرییەكان دەكات.

لەگەڵ ڕێزم (واژۆ)

من ئەمجۆرە نامانە بۆ بەرپرسی جۆراو جۆری وەك خاوەنی پاركینگەكان، كارگێڕی كۆمپانیاكان، بەڕێوەبەری فرۆشگاكان دەنێرم كەبەردەوام سەردانیان دەكەم.

☆ تەکنیکی ژمارە ٩٠

سوپاسنامە

ئایا کارمەندی فرۆشتن، ژمێریار، میکانیك، مامۆستاو کەسانیترت لەژیاندا هەیە بتەوێ لەداهاتودا سوودیان لێ ببینیت؟ ئەگەر وەلام ئەرێیە، بێگومان بۆ بەرپرسەکەی یان سەرۆکەکەی سوپاسنامەیەك بنێرە.

## ٩١

## چۆن لەنێو کۆمەڵێکدا لەجیاتی پەیڕەوێك ڕێبەرێك بێت

هەمیشە لەکۆڕێکدا دوای لێدوانێك یان بەنامەیەك کەسانێك پێش ئەوانیتر چەپڵە لێدەدەن بەدەنگی بەرز هان دەدەنو کاریگەریی لەسەر کەسانیتر دەکەن، ئەوانە خاوەن خەسڵەتی ڕێبەرایەتیەکی بەرجەستەن.

وابزانە لەهۆڵێکدا لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوکارەکانت دانیشتیت گوێ بۆ لێدوانی سەرۆکی کۆمپانیاکەت دەگریت. ڕەنگە بێت بەخەیاڵتدا سەرۆکەکەتان کەلەحاڵی قسەکردندایە هێندە حەواسی گەرمە لەکارەکەی خۆیدا ناتوانێت حاڵەتی ڕوخسارو جوڵانەوەی ئامادەبووان دەرك بکات. بەڵام وانییە، وتەبێژان لەکاتی لێدواندا سەرنجی هەموو ڕوخسارو جوڵەی ئامادەبووان دەدەن ئەوان دەتوانن ئاگایان لەوە بێت چ کەسێك لەئامادە بووان توانای ڕێبەرایەتیو کارگێڕیی هەیە.

> **٩١ تەکنیکی ژمارە ٩١**
>
> **ڕێنمایی گوێگرەکان بکە**
>
> **بێ گوێدانە ئەوەی وتەبێژ تا چ ئەندازەیەك گرنگو ناسراوە، ئەو لەناخی خۆیدا بەگومانەو دەیەوێ قبوڵ بکرێت.**
>
> **کەسانی سەرکەوتوو جیاوازی دەکەنو تۆش دەتوانیت لەڕیزی ئەواندا بیت، ئەوان ئاگایان لەوەیە ئێوەی ئامادەبووان لەکۆڕەکەدا ڕێنمایی دەکەیت. هەوڵبدە یەکەم کەس بیت بۆ وتار بێژ بەگەرمییەوە چەپڵە لێبدەیت.**

## ٩٢

### چۆن جوڵەی دروست ئەنجام بدەین

کەسانی سەرکەوتووی مەیدانی ژیان هەمیشە دەزانن لەنێوان خۆیان و کەسانیتردا چ جیاوازییەك ئاڵوگۆڕ دەکرێت. ئەوان دەزانن چ کەسانێك براوەو چ کەسانێك دۆڕاوون. ئەوان زانیاری تەواویان دەربارەی دەسکەوتەکان هەیە.
کاتێ دوو بازرگانی ژاپۆنی یەکتری دەبینن ئاشکرایە کامیان لەویتریان بالاترە. بەسەرنجدان لەچەمینەوەو دەبرینی ڕێز بۆ یەکتریی بۆت دەردەکەوێت. لەئەمریکا ڕەوشێکی بەجۆرە نییە. ڕێز لێنانی کەسەکان شتێك دیاری ناکات. بەلام کەسانی سەرکەوتوو بەرلەوەی قەڵەم بخەنە سەر کاغەز یان دوگمەیەکی کۆمپیتەر فشار بدەن، هەموو شتێك بەدروستی هەژمار دەکەن. ئەوان دەپرسن کێ لەم پەیوەندیەدا زۆرترین قازانجی کردووە. یان من دەتوانم چی بکەم تاکو دەسکەوتێکی زیاتر بەدەست بێنم.

**تەکنیکی ژمارە ٩٢**

**کارتی دەسکەوت**

**هەر دوو کەسێك کەپێکەوە پەیوەندیان هەبێت بێئەوەی بیانەوێ و بزانن دەسکەوتێکیان هەیە کەپەیوەندی ئەوان پێکەوە نیشان بدات. ئەم دەسکەوتانە هەمیشە دەگۆڕێن. بەلام بنەمایەك بەهێزی خۆی دەمێنێتەوە. ئەو کەسەی دەسکەوتی کەمتری هەیە بەکەسێك کەدەسکەوتی زیاتری هەیە پڕ دەکاتەوە. کەسێك گوێ نەداتە دەسکەوت. لەیاری دەردەکرێت. ئەویش بۆ هەمیشە.**

کتێبە چاپکراوەکانی #سایە ساڵی ۲۰۱۸
۷کتێب لە بوارە جیاوازەکانی گەشەپێدان:

#رۆبێرت_کیۆساکی
باوکی دەوڵەمەند باوکی هەژار
منداڵی دەڵەمەند منداڵی زیرەک
بابەت: گەشە پێدانی ئابووری خود

#جاک_کانفیلد
سڵاو لە خۆم
بابەت: بنەماکانی سەرکەوتن
#برایان_ترەیسی
بۆ بردنەوە قسە بکەن
بابەت: هونەری وتار بێژی

#لیل_لۆندز
چۆن لەگەڵ خەڵکی گفتوگۆ بکەین
بابەت: ئەتەکێتی گفتوگۆ

#ریچارد_تیمپلار
یاساکانی ژیان
بابەت: ۱۰٦ یاسا بۆ ژیانێکی باشتر
#ریچاد_تێمپلار

یاساکانی کار
بەبەت: ئەتەکێتی کار

ئەم کتێبانە لە پرفرۆشترین کتێبەکانی جیهانن!!
ئەگەر تۆش ئەتەوێت گۆڕانکاری لە ژیان و کارو پیشەکەت دروست بکەیت ئەوە ئەم کتێبانە بخوێنەرەوە!!

# HOW TO TALK TO ANYONE

## LEIL LOWNDES

- چۆن بچینە نێو دڵی خەڵکی یەوە؟
- چۆن هەرگیز بیر لەوە نەکەیتەوە ئێستا بڵێم چی؟
- چۆن وەک کەسێکی گرنگ گفتوگۆ بکەین؟
- چۆن ڕێزو خۆشەویستی ئەوان بگرین؟
- چۆن لەگەڵ کەسی ناوداردا گفتوگۆ بکەین؟
- چۆن گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی دژوار بکەین؟
- چۆن لە میوانیدا هەڵە نەکەین؟

کتێبەکانی سایە هاوڕێی هەموو تەمەنێک